# بنەماكانی
# فەلسەفەی شیكردنەوەی مەنتیقی

## د. حەمید عەزیز

هەولێر كوردستان
٢٠٠٥

**ناوی كتێب: بنەماكانی فەلسەفەی شیكردنەوەی مەنتیقی**

– د. حەمید عەزیز

– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

– بەرگ: هۆگر سدیق

= سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات

– تیراژ: ١٠٠٠ دانە

– ژمارەی سپاردن: (٣١٧)

–– چاپی یەكەم: ٢٠٠٥

– نرخ: ٢٠٠٠ دینار

– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی كتێب –٢٩– (١٣٢)

ناونیشان

دەزگای چاپ و بلاْوكردنەوەی موكریانی

پۆستی ئەلكترۆنی: asokareem@ maktoob.com

ژمارەی تەلەفۆن: 2260311





## ناوەرۆك







## پێشەکی

به تێکڕایی ئەو چوار نووسینەی ناوەڕۆکی ئەم کتێبەیان لێ پێك هاتووه بەشێکن له ڕێبازێکی بەربلاّوی ئێستای فەلسەفه له ئەورووپا بەگشتی و لەو ولاّتانەی بە ئەڵمانی دەدوێن بەتایبەتی. ئەگەر چی پتر مۆرك و ڕوخساری ئەکادیمییان پێوه دیاره بەلاّم بەهیچ جۆرێك ئەو ڕاستییه نابەزێنن کە خەت و خاڵی ڕێبازی فەلسەفەی هاوچەرخی ئەورووپایان پێوه دیاره. لەم سەردەمەماندا کە بە سەردەمی شۆڕشی تەکنەلۆجی ناودەبرێت و تا ڕادەیەکی زۆر ئایدۆلوجی، له هەندێ بابەت و کایەیدا، لەبەردەم شۆڕشه سەرتاپا و جیهانگیرییەکەی زانستدا پاشەکشەی کردوه، ئەگەر بایەخ بەژیر و مەنتیق بەمانای (ڕاتسیۆ) نەدرێ ئەبێ پەنا ببردرێته بەر چ ئامرازێکی تری توێژینەوەی زانستییانه، ئەو توێژینەوەیەی بەردی بناغەی تەلارێك دادەنێ کە وەك دەریا بێ سەروبن و بێ دەروازیه.

لەم نووسینانەدا هەوڵمان داوه ئەوەندی توانیبێتم بابەتەکە بە زمانێکی سادەو ڕەوانی کوردی بنووسم بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی نووسین و کتێبخانەی کوردیدا، لەم سەردەمەدا، لایەك لەو بابەته بکرێتەوه کە ئەمڕۆکە کۆڕ و کۆمەڵە ئەکادیمیاکانی ئەورووپای ناچار کردوه سەر گەرمی توێژینەوەیان بن. بەتایبەتی داهێنانی پێودانگێکی زانستی بۆ نرخ پێ دان و هەڵسەنگاندنی فەلسەفه بەگشتی و میتافیزیك بەتایبەتی.

بۆ پتر سەرنج ڕاکێشان بۆ لای ئەم بابەته، وەك لەم سەردەمەماندا لە ئەورووپا شان بەشانی ڕێبازه هاوچەرخەکانی تری فەلسەفه، بەرهەمێکی فەیلەسوفێکی بەناوبانگی ئەڵمانیم کردوه بە کوردی و وەك بەرهەمێکی هەڵبژارده لە کۆتایی ئەم کتێبەدا چاپ دەکرێت.

**قەڵادزێ**

**کوردستانی باشور**



## سەرەتا:

له سەرەتای سەدەی بیستەم بەگشتی و دوای بارخستنی جەنگی یەکەمی جیهان بەتایبەتی له کۆڕو کۆمەڵە زانستییەکاندا بەتوندی لۆمە و سەرزەنشتی فەلسەفه کراوه، گوایه بە تەمەن زۆر لە زانست کۆنتره کەچی تائێستا پەرەسەندنێکی سەرتاپاگیریی ئەوتۆی نەکردووه ئەگەر لەگەڵ زانستەکاندا بەراورد بکرێت.

مرۆڤ چەندین سیستەم و ڕێبازی فەلسەفه بەدی دەکات کە بە دوای یەکدا یاخود شان بەشانی یەکتری دامەزراون. کەچی لەنێو خۆیاندا هەر خەریکی ڕەخنەکردنی یەکتری بوون، بگره ویستویانه بیرو بۆچوون و تێزه و گریمانه و تیوری یەکتری پووچەڵ بکەنەوه. له مێژووی فەلسەفەدا بەدەگمەن دوو فەیلەسوف دەبینرێن کە له فەلسەفەکەیاندا لەگەڵ یەکتری تەبا بووبن، یاخود یەکترییان ڕەخنە نەکردبێ!

له بەرامبەر ئەم دیمەنە نالەبارەدا زانستەکان تیشك ئاسا پەرەیان سەندوه. گەشەیان کردوەو ئەنجام و گۆڕانی وایان لێ کەوتۆتەوه سەرتاپای ژیان و کۆمەڵ و شارستانییان گرتۆتەوه.

ئایا ئەمە دیاردەیه یان نا؟

ئەگەر دیاردەیه بۆ ئەوەندە درێژەی کێشاوه. دیاره شتێکی کاتی و ساتییه و ئەگەر هۆی کەوتنەوەو پەیدابوونەکەی نەما خۆیشی نامێنێ. ئەو تەمەن درێژییەی فەلسەفە، ئەو بابەته جۆر بەجۆرانەی هێناونیەته گۆڕەپانی توێژینەوەو لێکۆڵینەوه، ئەو پەیوەندییه زۆر و زەبەندە فره لایەنانەی لەگەڵ بابەتەکانی تری چالاکی بیرومێشکی مرۆڤدا هەیبوون هەموو جۆره مۆرکێکی دیاردەیی لەم ڕەوشه ڕەت دەکەنەوه.

کەوابوو ئەمە لە سروشتی فەلسەفه و ئامرازو پوختەی بابەت و ناوەڕۆکەکەیەوه کەوتۆتەوه! ئەگەر وەلاّمەکە بە (ئا) بێ دەکرێ بیر له دۆزینەوەی چارەسەرێکی ئەم ڕەوشه بکرێتەوه یان؟ باشه بۆ تائێستا هەوڵێکی ئەوتۆ لەم بارەیەوه له مەیداندا بەدی ناکرێ؟





لەنێو ئەو هەڵوێست و وەڵامانەی بەرامبەر بەم کێشەیە دێنە بەرچاو دووجۆرە هەڵوێست و لایەنی لە یەکتری جیاواز دەبینرێن:

- هەندێك لەو باوەڕەدان و منیش پشتیگیرییان دەکەم ئەم ڕەوشە دیاردە نییە بەڵکو سروشتی فەلسەفە خۆی وایە و ئەمەی لێ دەکەوێتەوە. ئەم بیر جودابییە، ئەم ڕێك نەکەوتن و ناتەبایی و جیاوازی بۆچوونە نالەباریی و نەنگی نییە، بەڵکو شتێکی ئاساییە، نیشانەی گەرم و گوڕیی و بەپێزیی و زیندویی فەلسەفەیە. فەلسەفە لە ژیانەوە پەیدابووە هەمەڕەنگی و دەوڵەمەندیی و بەرەکەت و پیتی ژیان خۆی دەردەبڕێ.

- لایەنەکەی تر پشت ئەستوور بەشیکردنەوەی مەنتیقی و پەرەسەندنی ئامرازەکانی مەنتیقی بیرکاریی (ماتماتیك) جیاوازیی نێوان بابەتەکانی زانست و بابەتی فەلسەفە لەبەرچاو دەگرێ. وای دادەنێ بابەت و کەرەسە و تێزەکانی ماتماتیك و زانستییە ئەزموونییەکان پێودانگی تایبەتییان (تاقیکردنەوە، سەرنج دان، شیکردنەوە... هتد) بۆ داهێنراوە بەهۆیەوە دەکرێ کۆنترۆڵ بکرێن، ڕاستی و ناراستییان پشت ڕاست و ساغ بکرێتەوە. ناکۆکی و ناتەبایی نێوانیان بەلایەکدا بخرێن. بابەتەکانی فەلسەفە بەگشتی ئەمەیان لەگەڵدا ناکرێ و ئەم جۆرە شەن و کەوکردنە هەڵناگرن بۆیە وەك زانست توانای پەرەسەندنیان نییە. بۆ ئەوەی ئەم لایەنە تەمومژاوییە پترو چاکتر ڕوون بکەینەوە وامان بەباشزانی سەرنجێك، لەپێشدا، لەو بارودۆخە بدەین کە بیرو بۆ چوون و فەلسەفەی کارناپ لە باوەشیاندا گۆش بوون.

*** قەڵادزێ ***

**کوردستان ٢٠٠٤ ز**





## (١)

## ڕێبازی ئەزموونی مەنتیقی

دوور ناڕۆین ئەگەر بڵێین ئەو قۆناغەی کەوتۆتە نێوان هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانەوە، بەپێزترین قۆناغی پەرەسەندن و گەشەکردنی فەلسەفە و لێکۆڵینەوەی زانست بووە لە ئەڵمانیادا بەتایبەتی و لەو دەڤەرانەی ئەڵمانی زمانن بەگشتی.

ڕێبازی ئەزموونی مەنتیقی کۆڕی ڤیەننا، شان بەشانی کانتیانیزمی نوێی ڕێبازی ماربورگ، فینۆمێنۆلۆجی ئیدمۆند هوسەرل، مەنتیقی بیرکاریی گۆتلۆب فرێگە، ئیگزیستیان تیالیزمی مارتن هایدیگەر، هێزو وزەو توانایەکی نوێی گیانییان بە بەر شادەماری ژیانی فەلسەفەدا کردوە، بەرەو قۆناغێکی پێشکەوتوو و باڵاتر تەکانیان داوە، بگرە جۆری بیرکردنەوەی فەلسەفەییان بە بارێکی تردا گۆڕیوە. ماکس پلانك، ئاینشتاین و هایزنبێرگ لە چەند کۆشش و هەوڵێکی سەرکەوتووی زانستیدا بنچینەو جەوهەر و پوختەی تیۆرییە زانستییەکانیان خستۆتە بەر تیشکی ڕەخنەو لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆ چەندین ئەنجامی سەرتاپاگیرانەیان لێ کەوتەوە.

گۆتلۆب فرێگە (١٨٤٨-١٩٢٥) هەوڵیداوە ساغی بکاتەوە کە ماتماتیك لە مەنتیق کەوتۆتەوە بگرە مەنتیقێکی پەرەسەندووە. بۆ ئەم مەبەستە مەرجە بنەرەتیەکانی ماتماتیکی توێ توێ کردوە، دەریخست کە ئەمانە چەند مەرجێکی مەنتیقی پەرەسەندوون و هیچ پەیوەندییان بە (دەروونناسی) سایکۆلۆجییەوە نییە. ئینجا سەرگەرمی ئەوەبوو پێناسە بکات ئایا ژمارە چییە[١]. لە وەڵامدا پەنای بردۆتە بەر پێناسەی مەنتیقیی چەمکی ژمارە. ژمارە بەهایەکە (قیمەتە). ئەگەر پەیوەندییە مەنتیقییەکان شیبکرێنەوە دەردەکەوێ کەرستە و هاوکێشەکانی ماتماتیك بنج و بنەڕەتی مەنتیقیان هەیە. کەرەسە و بابەتی هەردوولا بەپێچەوانەی



سایکۆلۆجییەوە پابەندی کات و شوێن نین هەربۆیە ڕاستییەکانی مەنتیق و بیرکاریی پەکیان لەسەر ئەوە نەکەوتوە مرۆڤ بە ڕاستیان دابنێ یان نا چونکە خۆیان سروشتێکی شیکاریی پێشیانەیان هەیە و لە خۆیاندا ڕاستن، پێویستییان بەپشت ڕاستکردنەوە نییە جا ئەگەر بارودۆخی ئەکادیمی، زانستی و فەلسەفی ئەوسای زانکۆکانی نەمسا بەگشتی و ڤیەننا بەتایبەتی بێنینە بەرچاو هۆی پەیدابوونی ئەو بزوتنەوە فەلسەفییە (ئەزموونییە مەنتیقی)یەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە کارناپ سوارێك بووە لە سوار چاکەکانی ئەم گۆڕەپانەدا.

١- کۆڕی ڤیەننای نەمسا ڕێکخراوێکی کۆمەڵە پسپۆڕ و زانا و فەیلەسوفی ڕێبازی پۆزیتیڤیزمی نوێیە کە ساڵی ١٩٢٨ لە زانکۆی ڤیەننا لەلایەن پرۆفیسۆری فەلسەفە مۆریتس شلیك دامەزراوە. دروشمی سەرەکی ئەم کۆڕە بژارکردنی فەلسەفە لە میتافیزیك و بەرزکردنەوەی بۆ ئاستی زانستە ئەزموونییەکان و بایەخ دان بە هەردوو لقی مەنتیق و تیۆری زانین بوە. لە ساڵی ١٩٣٠ بەولاوە گۆڤاری ساڵانەی زانین (Erkenntnis) چالاکی و بەرهەمی ئەندامانی کۆڕەکەی بڵاوکردۆتەوەو بەجیهان ئاشنای کردوون. سەرەڕای ئەمە لەژێر ناونیشانی (بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ئێرنست ماخ)دا ناوبەناو نامیلکە و لێکۆڵینەوەی هەمەجۆر بڵاوکراوەتەوە. ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە لەسەرەتادا ئەندامانی کۆمەڵەی ئێرنست ماخ بوون، کە لە ساڵی ١٨٩٥-١٩٠١ لە هەمان زانکۆ مامۆستای فەلسەفەی زانستە ئیندەکشنییەکان بووەو درێژەی بەدابودەستور و ڕێ و ڕەسمی بەگژداچوونی بیروبۆچوونی میتافیزیکی داوە[٢]. ساڵی ١٩٢٩ یەکەم بڵاوکراوەی ڕێکخراوەکە لەژێر ناونیشانی «تێگەیشتنی زانستییانەی جیهان» کە پێشکەش بەشلیك کرابوو، کەوتە بازاڕەوە. تیایدا بەم جۆرە دەست پێ کراوە:

«ساڵی ١٩٢٢ مورێس شلیك لە کیلەوە (باکووری ئەڵمانیا) هێنرا بۆ ڤیەننا. کۆششەکەی لە پاوانی زانستی ڤیەننادا هاتەبەر. خۆی فیزیکییە، تەوژمی بە بەر





ئەو دابونەریتەدا کرد کە کاتی خۆی لەلایەن ماخ و بۆڵستمان رەنگی رێژراو لەلایەن ئەدۆلف شتووری دژ بە میتافیزیك پەرەی پێدرا» [3]. لەم چەند ڕستەیەدا دەردەکەوێ کە شلیك دامەزرێنەری کۆڕەکەیە. ئەو دابونەریتەی ناوی هێنراوە مەبەست لەو رێباز و رێرەوە ئەزموونەکی و فەلسەفەی بژارکراو لە میتافیزیکەیەکە لەلایەن ئیرنست ماخ و لودڤیگ بولتسمان و ئەدۆلف شتوورەوە جێگیرو پەرەی پێدراوە. دامەزراوە نوێیەکە هەوڵ ئەدات کۆششە پۆزیتیڤیستەکانی ئێرنست ماخ درێژە پێ بدات بەتایبەتی رەوتی دژایەتیکردنی میتافیزیك. ئەمەش دامەزراندنی کۆشکی فەلسەفەی لەسەر بناغەیەکی زانستیی لێ دەکەوێتەوە.

ئەم بلاۆکراوەیە دەکرێ وەك مانیفێستێکی زانستی کۆڕەکە تەماشا بکرێ لە هەندێ شوێنیدا رەوت و بیروبۆچوونی ئەندامەکانی بە ئاشکرا دەخاتەڕوو، هەڵوێستیان بەرامبەر بە فەلسەفەی خۆیان و رێبازەکانی تری فەلسەفە بەگشتی ئاشکرا دەکات. ناوی رێبازەکە، وەك لێرەدا باسکراوە، لەم جۆرە رەوتەوە کەوتۆتەوە:

*رێبازەکەمان لە فەلسەفەدا «ئەزموونی و پۆزیتیڤیستیە، لەوەدا بڕوامان بە یەك جۆرە زانینی ڕەوا هەیە، زانینێك لە شارەزایی (خیبرە) و ئەزموون بکەوێتەوە. ئەمە سنوری زانستی رەوا دەکێشێ. جۆرە پەیڕەو (میتۆدە)ێکی دیاریکراو بەکاردەهێنرێ، شیکردنەوەی مەنتیقی زمان. بەواتایەکی تر، کۆششی زانستییانە بەو مەبەستە دەکرێ بەهۆی بەکارهێنانی شیکردنەوەی مەنتیقی ماددە و بابەت و کەرەسەی ئیمپریکی یەکگرتن و یەك رەنگیی کردنی زانست پیادە بکرێ»* [4].

زانست سیستەم و پێکهاتەیەکی هەمەڕەنگی بەیەکەوە تەبا و گونجاوی ڕستە و پرۆپۆزیشن و قانون و گریمانەیە کە لە رەوشی تایبەتیدا بواری پێشبینیکردن دەدات. تیۆری زانستیش شیکردنەوەی پەیوەندی نێوان ئەم ڕستە و پێکهاتە ناوەکی و جۆری رۆنانیانە و ئینجا کامیان رەواو دروستن و کامیان نا. ئەگەر لەم



روانگەوە سەرنجی ئەو کێشانە بدرێت کە لە فەلسەفەدا بەگشتی وەك بابەت لێیان کۆڵراوەتەوە، توێ توێ کراون و هەوڵ دراوە بەشێوەو جۆری فرە رەنگی بەلایەکدا بخرێن لەم سێ جۆرە بەولاوە نین:

یەکەم- چەند کێشەیەك کە ناوەرۆك و روخسارێکی ئەزموونەکیان هەیە، دەکرێ پشت ئەستور بە میتۆدەی زانستییە ئەزموونییەکان بەلایەکدا بخرێن.

دووەم- چەند کێشەیەك کە لە جۆرێکی تایبەتی بەکارهێنانی زمان کەوتونەتەوە، ئەگەر چەمك و ڕستەکان زانستییانە پێناسە و روونبکرێنەوە، کێشەکە بەلایەکدا دەخرێ و وەلاّمی پرسیارەکان بەدەست دەکەون.

سێیەم- جۆری سێیەم ئەو کێشانەیە کە میتافیزیکیان لێ پێکهاتووە، ئەم کێشانە کە لەسەر شێوەی پرسیار دێنە بەرچاو وەلاّم نادرێنەوە، هەروەها ناکرێ بەزمانی زانست دەرببڕدرێن یاخود بە چەمکی زانستییانە فۆرمەلە بکرێن و دابڕێژرێنەوە.

رێبازی کۆڕی ڤیەننا هەوڵی داوە فەلسەفە توند و تۆڵ بەزانستە ئەزموونەکیەکانەوە گرێ بدات، پلەو پایەی مەنتیق تا دەگاتە ئەو ئاست و رادەیەی دەکرێ ببێ بە میتۆدە فەلسەفەکردن پتەو و جێگیر و قایم بکات. میتۆدەی فەلسەفەکردن بێگومان هەردوو مەنتیقی بێ گەردی فۆرمەکی (روخساریی) و مەنتیقی پراکتیکی واتە تیۆری زانین دەگرێتەوە [5]. ئەم هەنگاوە کە بریتییە لە بەکارخستن و پیادەکردنی مەنتیق لە کێشەکانی فەلسەفەدا، جۆرە دابەشکردنێکی ڕستەکانی لێ دەکەوێتەوە کە بەم شێوەیەیە:

یەکەم- ڕستەی شیکاری پێشیانە (Analytische Saetze apriori): ئەمانە ڕستە، پرۆپۆزیشن و تیۆرییەکانی مەنتیق و ماتماتیکن، روخسارەکین، راستن بەپێی ئەو ناوەرۆکە روخسارەکییەی کە هەیانە، هیچ شتێك دەربارەی جیهانی دەوروبەر،





جیهانی بابەتی نالێن، ئەو هیماو سیمبۆلانەی تیایاندا بەكارهاتوون لە هەموو جیهانێكی شیاوەكیدا راست و دروستن.

دووەم- ڕستەی لێكدراوی پاشیانە (Synthetische Saetze a posteriori): ئەم رستانە ئەزموونەكین وەك گریمانە و پرۆپۆزیشنەكانی زانستە ریئالیستەكان وەك (فیزیك....هتد)، شت دەربارەی بابەتەكانی دەوروبەر دەڵێن، پێویستیان بە ساغكردنەوە هەیە. ئەگەر راست بوون دەمێننەوە ئەگەر نا لە جیهانی زانست دوور دەخرێنەوە. ئەمانە ئەو كەرەسەیەن لەدوای ساغ بوونەوەو پشت راستكردنەوەیان بەپێی پێوانە یاخود بەپێی پێودانگی تایبەتی زانستی كە بۆ ئەم مەبەستە دادەنرێن، وەك تابلۆ تەلاریی وێنەی جیهانی زانستیان لێ دروست دەكرێ.

سێیەم- سەرەڕای ئەم دوو جۆرە ڕستە و پرۆپۆزیشنانە، جۆرە ڕستەیەكی تر هەیە كە لە بوارێكی تردا بەرچاو دەكەون. ئەمانە نە شیكارن و نە لێكدراون، بابەتی زانست و مەنتیق و ماتماتیك نین بەڵكو بابەت و ناوەڕۆكی میتافیزیكن. ئەم جۆرە ڕستە و دەستەواژانە ئەگەرچی ئاسایی بێنە بەرچاو، پووچ و بێ واتان و جۆری بەكارهێنانەكەیان لە بواری تێكستێكی میتافیزیكدا بە پێچەوانەی بنەڕەتەكانی سێنتاكس - سیمانتیكسی زمانە، شیكردنەوەی مەنتیقییانە ئەم لایەنە ساغ دەكاتەوە. پشت ئەستور بەو نووسینانەی ئەندامانی ئەم كۆڕە لە بۆنەی جیاوازدا بڵاویان كردۆتەوە دەردەكەوێ كە لەنێویاندا پسپۆری مەنتیق و ماتماتیك و زانای فیزیك و زانستی كۆمەڵایەتی و زانستی گشتی زمان و هتد... هەبوون. بۆ بەپێزكردن و پەرەپێدانی گەنجینەی بابەتەكانی مەنتیقی نوێ و پەیڕەو و پرۆگرامەكانی كۆششیان كردوەو هەوڵی سەركەوتوانەیان داوە. سەرەڕای ئەمە هەموویان بەتێكڕایی لەسەر چەند پرینسیپ و بنەڕەت و بنچینەیەكی گشتی كۆك و تەبابوون و بەهۆی بڵاوكراوەی جۆربەجۆر داكۆكییان لێ كردون و بۆ پتر جێگیركردن و بڵاوكردنەوەیان مشوریان خواردوە:



یەكەم: بیركاریی — ماتماتیك ئەگەر بنج و بناوان و بنچینەكانی توێ توێ بكرێن دەردەكەوێ كە خۆی لە مەنتیقەوە كەوتۆتەوەو بگرە خۆی لە مەنتیقێكی پەرەسەندوو بەولاوە نییە. هەموو چەمكێكی ماتماتیك دەكرێ لە چەمكە بنەڕەتییەكانی مەنتیقەوە بكەونەوە[٦]. وەك لەمەوبەر وتمان، ئەم بڕیارە ئەو ئەنجامەیە كە لە لێكۆڵینەوە مەنتیقییەكەی گۆتلۆب فرێگە و رەسڵ و وایتهێد كەوتۆتەوە.

دووەم: پێویست ناكات هیچ جۆرە پێودانگی زانستی بۆ پوچەڵكردنەوەی بیروبۆچوون و گریمانەكانی میتافیزیك بەكاربهێنرێن چونكە لە خۆیاندا گەرای بێ مانایی و بێ واتاییان تیادا دیارە.

سێیەم: فیزیك و زمانی فیزیك دەكرێت وەك نموونەیەك بكرێت بە بنچینەیەك و كۆشكی یەكگرتنی زانستەكانی لەسەر بنیات بنرێ.

ئەمە ئەو پرۆژەییە كە كارناپ لە چەند بەرهەمێكیدا هەوڵی پیادەكردنی داوە. كارناپ وتویەتی: لەو سیستەم و پرۆژە یەكگرتووەی زانستدا دەكرێ ((چەمكەكانی هەموو زانستەكان لەو سیستەمەدا جێگەیان ببێتەوە، واتە: بگەڕێنرێنەوە سەر چەند چەمكێكی بنەڕەتیی))[٧].

چوارەم: پشت ئەستوور بە ئەنجامی لێكۆڵینەوەكانی ڤتگنشتاین، كۆڕی ڤیەننا وای داناوە ڕستەكانی مەنتیق روخسارو بێ ناوكن واتە ئەوەی لە سەلمێنراودا دەستگیر دەبێ پێشتر لە دراو و داواكراودا هاتووە. ڤتگنشتاین وتوویەتی:

((ڕستەكانی مەنتیق تاوتۆلۆجین)) (واتە هەمان گوتن). هەروەها ((ڕستەكانی مەنتیق هیچ شتێك نالێن. ئەمانە چەند ڕستەیەكی شیكارین))[٨]. ڕستەی مەنتیق لە سێ بەش پێك دێت، ناو (بكەر)، بار (خەبەر) و ئامرازێك كە ئەم دووانە بەیەكەوە دەبەستێتەوە. ئەم ئامرازە لە زمانی كوردیدا نییە و مەبەست لە (is)ە لە زمانی ئینگلیزیدا. ئەگەر بوترێ: سوكرات مرۆڤە. هیچ نەوتراوە چونكە مرۆڤ





وەك بار (سیفەت ، مەحمول) لە چەمكی بۆچوونی سوكرات خۆیدا هەیە و هیچ كاتێك ناكرێ سوكرات مرۆڤ نەبێ یاخود (ئا هەر ئا)یە.

٢- ئەوی سەرنج رادەكێشی پێداگرتنی ئەم رێبازەیە لەسەر رۆڵ و بایەخی مەنتیق، شیكردنەوەی ڕستەكانی زمانی زانستەكان، كێشەكانی تیۆری زانین و پەنابردنە بەر میتۆدەی شیكردنەوەی مەنتیقی كێشەكان بەتایبەتی مەنتیقی نوێ. ئایا ئەم دیاردەیە شتێكی رێككەوتە یان نا؟ باشە بۆچی دەبێ زانكۆیەكی نەمسا، دوور لەو هەموو زانكۆیانەی ئەڵمانیا ببێ بە مەڵبەندی ئەم بزوتنەوەیە كە گۆڕانێكی بەرچاوی لەناو فەلسەفەدا بەدی هێنا، دوای جەنگی دووەمی جیهان بەهێزترین و بلاوترین تەوژمی فەلسەفەی لە ئینگلتەرەو ئەمەریكا و چەند ولاتێكی سكەندیناڤیادا لێكەوتەوە؟ تا چەند ئەو بۆچوونە راستە گوایە فەلسەفەی مەتریالیزم و پۆزیتیفیزم و ئەزموونەكی هیچ كاتێك خاك و ئاو و هەوای پێویستی شین بوون و گەشەكردنیان لە ئەڵمانیا و زانكۆكانیدا دەستگیرنەبووە؟! دەبێ بۆ ئەم سێ رێبازە لە ولاتی دووەمی فەلسەفەدا، دوای یۆنان، نامۆ بن؟ نەمسا و ئەڵمانیا دوو ولاتی ئەڵمانی زمانن بەلام دوو جیهانی لە یەكتری جیاوازن. پەرەسەندنی فەلسەفە لە نەمسا بەگشتی و لە زانكۆی ڤیەننا بەتایبەتی بەپێچەوانەی ئەو فەلسەفەیەی لە زانكۆكانی ئەڵمانیادا چرۆی كردوە مۆرك و شێواز و ناوەڕۆك و روخساری تایبەتی خۆی پێوەدیارە كە بەگشتی لە بارودۆخ و نەریتی تایبەتی كۆمەلایەتی و سیاسی و ئابوری ئەو ولاتە خۆی كەوتونەتەوە. لە كاتێكدا — لە سەدەی نۆزدەهەم- فەلسەفە لە ئەڵمانیادا، لە كۆڕو كۆمەڵە زانستییەكاندا- دوچاری دەستی ناكۆكی و جەنگی نێوان هەردوو رێبازی مەتریالیزم و ئایدیالیزم بووبوو، فەلسەفە لە نەمسا وەك هەواڵ ئەم كێشەیەی دەبیست. بۆ نموونە لە هەردوو زانكۆی ڤیەننا و گراتسدا چەندین مامۆستای فەلسەفە و فەیلەسوفی جودا بیر بەیەكەوە دەرسیان وتۆتەوەو داكۆكییان لە بیروبۆچوونی جیاوازكردوە. لە ساڵی



١٨٨٨ز لە زانكۆی ڤیەننا كۆمەڵەیەكی فەلسەفە وەك رێكخراو دامەزراوە ئەندامەكانی فەیلەسووفی جودا بیر بوون. لەو كۆمەڵەیەدا، بەتایبەتی لەو كۆڕە ناو بەناویانەی سازی كردوون، زۆر شتی جیاواز باسكراون وەك فەلسەفە و زانست و مێژوو و كێشەی كۆمەلایەتی و دەروونیی كە لە ئەنجامدا كتێبی بەپێز و رێباز و بابەتی بایەخداری لێ كەوتونەتەوە. وەك زانراوە زانای بەناوبانگی فیزیك لودڤیگ بۆڵستمان باشترین لێكۆڵینەوەكانی پێش ئەوەی چاپیان بكات لە كۆڕو سیمینارەكانی ئەم كۆمەڵەیەدا خوێندۆتەوە و لێیان كۆڵراونەتەوە[٩].

هەر لە زانكۆی ڤیەننادا زاناو فەیلەسوفی سروشتیی ئێرنست ماخ لە وتارو نووسین و بەرهەمە بەپیت و پێزەكانیدا كۆشاوە زانستی ئەزموونی، بەتایبەتی فیزیك، لە بیروبۆچوون و گریمانەی میتافیزیكی بژار بكات. رەخنەیەكی زانستییانەی لە بۆچوونی ((شوێنی رەها)) و ((شت لە خۆیدا))و چەمكی جەوهەر گرتووە؛ ئەو چەمكانەی تا ئەو سەردەمە بە بابەتێكی فیزیك دادەنران. جگە لەو هەوڵەی داویەتی چەمكەكانی زانست گوڵبژێرانە لە دوا رەگەز، لە ناوەرۆكی هاوردەی هەستەكانەوە وەربگرێ و دابڕێژێ[١٠].

دوای ماخ، موریتس شلیك كە ساڵی **١٩٢٢** لە هەمان جێگا بە مامۆستای فەلسەفە دانرا، درێژەی بەهەمان داب و نەریتی فەلسەفەدا. لە كۆڕە ئێوارەیەكی پێنج شەمماندا كۆڕی ڤیەننا كەوتەوە كە تیایدا وەك ئەندام چەندین فەیلەسوف و زانای فیزیك و بیركاریی و كۆمەلایەتی تیایدا بەشدار بوون وەك:

هانزهان، ئۆتۆ نویرات، رودۆلف كارناپ، فلیپ فرانك، فردریش ڤایزمان، هیربیرت فایگل، فلیكس كاوفمان، كارل مینگەر، كورت گوودل، ئیدگار تسیلزل و فیكتۆر كرافت كە بە مێژوونووسی كۆڕی ڤیەننا ناسراوە. وەك هەندێ سەرچاوە باسی





دەکەن لودڤیگ ڤتگنشتاین و کارل پۆپەر ئەندامی کۆڕەکە نەبوون بەلاّم پەیوەندی توندوتۆلّیان لەگەلّ هەندێ ئەندامانیدا هەبووە[11].

کۆڕی ڤیەننا، کە وەك سەرچاوەیەك چەندین باس و بابەت و کتێبی نایابی لێ کەوتۆتەوە وەك کتێبە بەنرخەکەی کارناپ ((بنیات نانی مەنتیقی – جیهان)) ئەم کتێبە لەسەرەتادا لەو کۆڕە تاوتوێ کراوە لە ئەنجامدا دوا روخسار و ناوەڕۆکی ئێستای پێ براوە. ئەم کۆڕە ئەمرۆ ئەگەرچی لایەنگیرانی لە ئەلّمانیا و ولاّتانی سکەندیناڤیا و ئینگلتەرەو ئەمەریکا و فەرەنسا و هتد... هەیە، بووە بە بەشێك لە مێژووی فەلسەفە. لەگەلّ ئەمەشدا شان بەشانی رێبازەکانی تری فەلسەفە وەك پراگماتیزم و ئیمپریزم لەم سەردەمەماندا شوێنێکی دیارو بەرچاوی هەیە. بزوتنەوەیەك بوو بەکردەوە گۆڕانی سەرتاپاگیریی لە بابەتی فەلسەفەی ئەلّمانی زماندا کرد؛ گۆڕانێك دەکرێ بە گۆڕانی بارگۆڕین Wende دابنرێ.

ئەو بارگۆڕینەی خۆی لەم خالاّنەدا دەبینێتەوە:

یەکەم: هەولّ دان بۆ بە زانستکردنی فەلسەفە، یاخود دانانی فەلسەفە لەسەر بنج و بناغەیەکی پتەو کە دلّ ئاوی لێ بخواتەوەو رێگای هیچ جۆرە گومان و دلّ کرمێ بوونێك نەدات.

دووەم: دارِشتنی پەیرِەو (میتۆدەیەك)ی رێك و پێك، پشت ئەستور بەو گۆڕانەی فرێگەو رەسلّ و وایتهێد لە مەنتیقدا کردبوویان بۆ پیادەکردنی چالاکی شیکردنەوەی مەنتیقی لە بوارە جۆربەجۆرەکانی فەلسەفەدا.

سێیەم: پتر بەگوڕخستنی رەوت و پرۆسەی رقەبەریکردنی میتافیزیك و رێبازەکانی.

سالّی ١٩٣٨ کاتێك رژێمی ئەوسای ئەلّمانیا ((نازییەکان)) نەمسایان داگیرکرد و خستیانە سەر ئەلّمانیا بەرەسمی داو و دەزگاکانی ئەم کۆڕە پێچڕانەوە. کارناپ



ماوەیەك پێشتر ڤیەننای بەجێ هێشتبوو بەرەو پراگ کەوتبووە رێ. ئینجا لەوێش ناچاربوو رووبکاتە چەند ولاّتێکی ترو دواجار لە ئەمەریکا جێگیربوو.

زۆرترین بابەت و بلاّوکراوەی ئەکادیمی ئەو فەیلەسوفانەی خۆیان بە لایەنگری ئەم رێبازە دەزانن، لەم سەردەمەماندا، سەر گەرمی شیکردنەوەی مەنتیقی سێنتاکس و سیمانتیکسی زمانن، بەتایبەتی زمانی زانستەکان و فەلسەفە لەلایان بووە بە زانستی میتۆدەو پەیرِەو بۆ ساغکردنەوەی راستی و ناراستی و مەرجی رەوابوونی گریمانە و چەمکی بەکارهاتوو لە چوارچێوەی سیستەمە زانستییەکاندا. کۆڕی ڤیەننا لە رۆژی دامەزراندنیەوە تاوەکو داخستنی لەلایەن دەسەلاّتی سیاسی ئەوساوە، بریتی بووە لە کۆمەلّەیەك چوست و چالاکی و بلاّوکردنەوەی بەرهەمی بەپێز. تاوەکو سالّی ١٩٣٧ شەش ژمارە لە گۆڤاری زانستی (زانین) بلاّوکراوەتەوە کە پڕبووە لە لێکۆلّینەوەو توێژینەوەی فەلسەفە و زانست و ماتماتیك و هتد. لەم مێژوە بەولاوە گۆڤارەکە لە هۆلەندە بلاّوکراوەتەوە بەتایبەتی لە شاری دێن هاخ (لاهای). لەو شەش ژمارەیەدا کە بە ئەلّمانی لە شاری لایپتسیش – دەزگای فیلکس ماینەر – دەرچووە چەند باس و خواسێك بەرچاو دەکەون ئەو رایە ساغ دەکەنەوە کە لەنێو کۆڕەکەدا فەیلەسوفی بیرو بۆچوون جیاواز هەبووەو بەیەکەوە کۆششی پەرەپێدانی ژیانی زانستی سەردەمی خۆیانیان کردوە. بەلاّم دوو رێبازی لە یەکتری جیا لەنێو بابەتەکانی ژمارە جۆربەجۆرەکانی گۆڤارەکە سەرنج رادەکێشن.

یەکەم- لایەنێکیان کە هانزهان و رۆدۆلف کارناپ بەرێوەیان بردوە هەولّیان داوە روخسار و ناوەرۆکی فەلسەفە لە بنج و بناوانەوە بەجۆرێك بگۆڕن وای لێ بێت نەك هەر هیچ پەیوەندی بە میتافیزیکەوە نەمێنێ بەلّکو بچێتە ناو باوەشی زانستەکانەوە[12].





دووەم- لایەنی دووەم ویستویەتی داب و دەستوری باوی فەلسەفە بپارێزێ و پەرەی پێبدات و بایەخی تیۆری زانین لەبەردەم و بەرامبەر زانستەکان ساغ و پشت راست بکاتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیە بووە کە گۆڤارەکە ناوی ((زانین))ی لێ نراوە. پرۆفیسۆر شلیك رابەری ئەم لایەنە بووە.

بۆ پتر داکۆکیکردن لە رێبازی نوێی کۆڕەکە و، پەیداکردنی لایەنگیر و جێگیرکردنی بنچینەی بۆچوونەکانیان لەبارەی فەلسەفەوە، ئەندامانی کۆڕەکە دەستیان بە سازکردنی چەندین کۆنفرانسی جیهانیی زانست کردووە و تیایدا فەیلەسوف و زانا ناودارەکانی ئەوسای ئەوروپا و جیهان باس و لێکۆڵینەوەیان تیادا پێشکەش کردوون. بەهاوکاری لەگەڵ کۆمەڵەی فەلسەفەی ئیمپریکی بەرلین بەرابەرێتی هانز رایشنباخ، کۆڕی ڤیەننا لە ١٥، ١٦، ١٧ی مانگی سێپتەمبەری (ئەیلول) ١٩٢٩ لە شاری پراگ پایتەختی کۆماری چیکی ئێستا کۆنفرانسی ((تیۆری زانینی زانستەکان)) بەستوە. کۆنفرانسی دووەم ساڵێك دواتر لە شاری کوونیگس بێرگ گیراوە[١٣].

جارێکی تر لە شاری پراگی چیك ساڵی ١٩٣٤ کۆنگرەی جیهانی فەلسەفە گیراو پێنج رۆژی خایاندوە. تیایدا نزیکەی ١٠٠ لێکۆڵینەوەو وتاری جۆراوجۆر پێشکەش کراوە. بەشداربووەکانی ئەڵمان و ئینگلیز و فەرەنسایی و ئیتالیایی بوون. بەم کۆنگرەیە کۆڕی ڤیەننا لە چوارچێوەی زمانی ئەڵمانی چۆتە دەرەوەو مۆرکێکی جیهانیی پێ براوە.

لە یەکەم رۆژی کۆنگرەکەدا بە تیروتەسەلی باسی سنوری زانست و فەلسەفە کراوە. پرۆفیسۆر هانز دریش (١٨٦٧ — ١٩٤١) باسێکی دەربارەی پەیوەندیی دەستیاوی زانست و فەلسەفە پێشکەش کردوە تیایدا وتویەتی: ئەگەر فەلسەفە بیەوێ لە زانستەوە نزیك بێ دەبێ ئەرکی پەیڕەوی رێکخستن و دیسپلین بگەرێتە ئەستۆ.



پەیڕەوی رێکخستن رێنمایی زانست دەکات بۆ داڕشتنی تیۆرییەکان. دریش هەوڵی داوە بەپێچەوانەی ئاینشتاینەوە بوونی کات و شوێنی رەها (موتڵق) ساغ بکاتەوە [١٤] و لەو باوەڕەدا بووە کە فیزیك وەك زانستی سروشت ناکرێ و ناتوانی دەستبەرداری ئەندازەی ئیکلیدس ببێ.

ساڵی ١٩٣٥ کۆڕی ڤیەننا توانی ((کۆنگرەی جیهانیی یەکگرتنی زانست)) بگرێ. لەو کۆنگرەیەدا کە نزیکەی ١٧٠ لێکۆڵەرەوەو فەیلەسوف و زانای بیست وڵات بەشدار ببوون. بابەتی رێتێچوون، شیکردنەوەی مەنتیقی و یەکگرتنی زانست، پوختەی چالاکی بەشداربووان بووە.

لۆرد بیرتراند رەسل (١٨٧٢ — ١٩٧٠) بە وتارێك کۆنگرەکەی کردۆتەوەو ئیش و کارەکان دەستیان پێ کردووە. سەرەڕای ئەو لێکۆڵینەوانەی تیایدا پێشکەش کراون لەسەر داخوازی کارناپ بڕیار دراوە کۆمیتەیەکی جیهانی بۆ یەکخستنی سیمبۆڵ و هیماکانی مەنتیق لە پێشدا بە زمانی ئەڵمانی ئینجا بە زمانەکانی تر دابمەزرێ. لەسەر داخوازی ئۆتۆ نوێرات بڕیار دراوە کاربکرێ بۆ ((پرۆژەی جیهانیی ئینسکلۆپیدی یەکگرتنی زانست))[١٥]. لە هاوینی ساڵی ١٩٣٦ لە شاری کۆپنهاگن -دانیمارك- کۆنگرەی جیهانیی یەکگرتنی زانست گیراوە، تیایدا کێشەی هۆیەکیی (هۆکار و ئەنجام) شی و توێ توێ کراوە و تیشك خراوەتە سەر رۆڵی ئەم مەسەلەیە لە فیزیك و زیندەوەرزانیدا (بیۆلۆجی).

پرۆفیسۆر نیلس بۆهەر (١٨٨٥ — ١٩٦٣) و پرۆفیسۆر فلیپ فرانك لە سەرەتای دەستپێکردنی کۆنگرەکە (٢٢ی حوزەیران) سەرو لێکۆڵینەوەیان دەربارەی کێشەی هۆیەکی لە فیزیك و زیندەوەرزانیدا پێشکەش کردووە[١٦]. ڤێرنەر هایزنبێرگ لە زاری بۆهەرەوە گیراویەتیەوە کە وتوویەتی:





کاتی خۆی لێرە لە کۆپنهاگن کۆنگرەیەکی فەلسەفەگیرا، زۆربەی زۆری بەشداربووان تیایدا لایەنگرانی ڕێبازی پۆزیتیڤیستی بوون. نوێنەرانی ڕێبازی ڤیەننا ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاویان تیایدا گێڕا. من لەو کۆنگرەیەدا هەوڵمدا لەبەردەم ئەم فەیلەسوفانە دەربارەی لێکدانەوەی تیۆری کوانتەم بدوێم. دوای خوێندنەوەی باسوتارەکەم بەرهەڵستیکردنێکی ئەوتۆ و ڕەخنە و پرسیاری گران و قورس نەکران. من وای بۆ دەچم وتارە باسەکەم وا بە خراپی پێشکەش کردبێ کەس لە بەشداربووان هەستی بەوە نەکردبێ من باسی چیم بۆ کردوون[١٧].

ئەگەر سەرنجێك لەو بڵاوکراوەو بەرهەمە فەلسەفییانە بدەین کە لەم سەردەمەماندا بەزمانی ئەڵمانی بڵاو دەکرێنەوە، یاخود ئەو وتارانەی پرۆفیسۆران لە زانکۆکاندا دەربارەی فەلسەفە دەیخوێننەوە یاخود ئەو کۆڕو کۆنگرە و سیمینارانەی سازدەکرێن بۆمان دەردەکەوێ کە کۆڕی ڤیەننا خەریکە لە بیردەچێتەوەو دەبێ بە ئالقەیەك لە زنجیرەی مێژووی فەلسەفە.

لەبەرهەمەکانی ئەندامانی کۆڕی ڤیەننا ڕێز لە ئێرنست ماخ گیراوە، تەنانەت کۆمەڵەی ئێرنست ماخیان دامەزراندووەو چەندین بابەت و بەرهەمیان لەژێر ناونیشانی «بڵاوکراوەکانی ئێرنست ماخ»دا بڵاوکردۆتەوە.

ئێرنست ماخ (١٨٣٨ — ١٩١٩) پرۆفیسۆری ماتماتیك و فیزیکی تیۆری بووە لە پراگ، گراتس، ڤیەننا، ئینجا پرۆفیسۆری فەلسەفە لە زانکۆی ڤیەننا پایتەختی نەمسا. لە بەرهەمەکانیدا چەندین کێشەو بابەتی فیزیك و فزیۆلۆجی و فەلسەفە و تیۆری زانینی توێ توێ و شیکردۆتەوە. لەسەرەتادا هەندێ بیروبۆچوونی فەلسەفەی کانتی پەسند کردووە بەتایبەتی دوای ئەوەی کتێبی پرۆلێگۆمینای کانتی خوێندۆتەوە (هەروەك خۆی لە پەراوێزی ل(٢٤)ی شیکردنەوەی هەستەکاندا — چاپی ئەڵمانی باسی کردووە). ئەم کتێبە هەستی ڕەخنەکردنی میتافیزیکی لە



ناخدا وروژاندووە. بەڵام لە قۆناغێکی تری ژیانیدا کەوتۆتە ژێرباری فەلسەفەی بارکلی و کێشەی «شت لە خۆیدا» و «ڕستەی لێکدراوی پێشیانە» و «مەرجە پێشیانەکانی شارەزایی و ئەزموون»ی کانتی بە چەند گریمانەیەکی پووچو بێ کەڵك داناوە[١٨].

پشت ئەستور بە فەلسەفەی بارکلی (١٦٨٥ — ١٧٥٣) کە تیایدا دڵ کرمێ بوون لە بوونی ماددە دەبینرێ و هەست پێ دەکرێ و تای تەرازو بەلای —خۆ-دا دەشکێنێ، واتە هەستەکان و هەستکردن پێودانگی بوون و نابوونن، داکۆکی لە تیۆرییەکی زانینی ئایدیالیستی دەکرێ، ماخ ئەرکی سەرشانی خۆی، وەك لێکۆڵەرەوەیەکی سروشت و فەیلەسوف، لەوەدا دیوە بەهۆی شیکردنەوەی هەستەکان و هەستەوە چەمکی شارەزایی (خیبرە) لە گیاکەڵەی میتافیزیك پاك بکاتەوەو تەپ و تۆزی پاشماوەی نازانستی لێ بتەکێنێ.

چەمکی هۆکار و ئەنجام، بنچینەی هۆیەکی، تەنیا وێنەیەکی دەستکردی هەست و شارەزایی مرۆڤن. لە دەوروبەرو واقیعدا شتێك نییە بەرامبەر ئەم چەمکانە. سروشت بریتییە لە پرۆسەیەکی بەردەوام و نەپساوە. لەم پرۆسەیەدا هەر ڕووداوە، هەر قۆناغە، هەر ڕەوشە تەنیا یەك جار پەیدا دەبێ و دەردەکەوێ. ئەمە مەبەستی ماخ بووە لەو قسەیەی کە کردوویەتی و لە هەموو سەرچاوەو نووسراو و بابەت و مێژووی فەلسەفەدا بەتایبەتی فەلسەفەی نوێ و هاوچەرخ دووبارە و سێ بارە کراوەتەوە، واتە ئەو ڕستەیەی دەڵێ: «سروشت تەنیا تاکە جارێك لێرەیە!»[١٩]. دووبارەبوونەوەی ڕووداو و قەوماو بەیەکەوە بەسترانەوەی قانونییانەی ڕووداوی وەك یەك و هەمان ڕووداو کەوا دێتە بەرچاو بەپێی قانون بەیەکەوە بەستراون و بەدوای یەکدا دێن، ئەگەر هۆیەك دەرکەوت ئەنجامێکی لێ دەکەوێتەوە، بنچینە و قانونی هۆیەکی — تەنیا داهێنانی هێزی لاساییکردنەوەیە کە مرۆڤ هەیەتی.

زانستی سروشت ئەرکی پەردە لادان لەسەر ڕێکوپێکی و دیسپلینی ئاسایی جیهانی کەوتۆتە ئەستۆ. ئەمە بەهۆی دۆزینەوەو داڕشتنی قانونە سروشتیەکان دەبێ. ئەم ئەرکە بۆ ئەوەی بەتەواوەتی پیادەبکرێت پێویستی بە دەربڕینی وردو ڕێکوڕەوانی چەمکەکان هەیە. جیهانی دەوروبەر کە بە ماددی ناودەبرێ لە پەیوەندی کاردانەوەکانی ئەو ڕەگەزانە پێکهاتووە کە هەستەکانی مرۆڤ ڕەوشێکی تایبەتی ئەو ڕەگەزانەن.

کاتێك دەکرێ باسی زانینی زانستییانە بکرێت کە بیرو بۆچوونەکان لەگەڵ فاکتەکان و لەگەڵ یەکتری و لەناوخۆیاندا تەبا و گونجاو بن. بەلای ماخەوە پێویستە زانست باسکردنی ناوەڕۆکی هەستەکان، باسکردنێکی ورد و کورت و پوخت (ئابوریییانە)[٢٠] کە لە توانادا بێ، بەتاکە ئەرکی سەرشانی خۆی دابنێ.

هەروەها لەو باوەڕە دابووە کە بەرامبەر هەمموو دیاردەو ڕەوشێکی دەروونی (نەفسی) دیاردەو ڕەوشێکی فیزیکی هەیە[٢١] و هەردووکیان هاوتا و دوو ئەڵقەی یەك زنجیرن. ئەبێ ئەم بۆچوونەی ماخ تا چەند کاری لە کارناپ کردبێ بەتایبەتی لە پرۆژە بنچینەییەکەی یەکگرتنی زانست کە لە کتێبی بنیاتنانی مەنتیقی جیهاندا باسی کردووە و دەڵێ:

لەسەر بنج و بناغەی کەمترین ژمارەی شیاوەکی چەمکی بنەرەتی زمانێکی بەربلاو و فراوانی ئەزموونی زانستی دادەڕێژرێ!؟

لە تیۆری زانیندا ماخ ویستویەتی ساغی بکاتەوە جیاوازیی لە نێوان من و جیهان واتە لەنێوان دیاردەو شتدا نییە. بەبێ ئەوەی ڕونی بکاتەوە کە ئەگەر ئەو یەك ڕەنگییە ڕەوابێ چۆن وەڵامی ئەو ڕەخنەیە ئەداتەوە کە دەڵێ: چەند کەسێك (چەند منێك) تەماشای یەك بابەت دەکەن و بۆچوونی جیاواز لەمێشکیاندا دەربارەی ئەو



تاکە بابەتە پەیدا دەبێ! ڕاستە زانین جۆرە بڕیارێکە (حوکمدانێکە) بەلام دەبێ ئەو بڕیارە ڕاست بێ.

لەوەدەچێ ماخ بۆچوونەکەی کانت پشت گوێ بخات، کە من (خۆ) دەکات بەدوو بابەت.

یەکەم: منێك کە دەبێ بە بابەتی سەرنجدان و شارەزایی و زانین (منی ئەزموونی).

دووەم: منێك کە منی ئەزموونی دەبێتە بابەتی زانینەکەی ئەمەش منی ترانسندنتالی یەکگرتووی هۆشە[٢٢].

ماخ بەو بڕیارەی کە لە کانت دوور کەوتۆتەوە، لە پرۆسەی زانیندا بابەت دەکات بەسەرپشك، زانین سیستەمێکی بڕیار و حوکمدان نییە کە پەکی بە کات نەکەوێ و بەبێ کات و سات ڕاست و دروست بێ و ئەو ڕاستییە پوختە و جەوهەرەکەی پشت ڕاست بکاتەوە، بەڵکو دیاردەیەکی تاراددەیەك بەردەوام و مێژوویی و بیۆلۆجییە. کانت (من، خۆ)ی کردووە بە سەرپشك و وای داناوە کە زانین لە دوو هاوکێشە پێکدێت بەلام هاوکێشەکە بەلای ڕۆڵی مرۆڤ خۆیدا لاسەنگ دەبێ کە ئەویش دوو لایە، لایەکیان سەرنج دان و تێفکرینە و ئەوتریان چەمك و چوارچێوەکانی شارەزایی و هۆشن کە بەهۆی فامەوە زانین ڕێك و پێك دەکرێ و دەخرێتە نێو چوارچێوەی ڕاستەقینەی خۆیەوە.

ئەگەر چی ئێرنست ماخ لە ژیانی زانستی و ئەکادیمیدا ڕازی نەبووە پێی بوترێ فەیلەسووف و لە چەند بۆنەیەکدا وتویەتی، من نە ئایدیالیستم و نە مەتریالیست من لێکۆڵەرەوەی سروشتم، فیزیکناسیم. لەگەڵ ئەوەدا ئەگەر سەرنجی بەرهەمەکانی بدرێت بەتایبەتی: *شیکردنەوەی هەستەکان، میکانیك، بنچینەکانی زانستی گەرما*، زانین و هەڵە، چەند وتارێکی ساکاری زانستی، و چەند نووسینێکی تری دەردەکەوێ کە فەیلەسوفێکی چابوکی مەیدانی بیرو ژیرو زانستە و داکۆکی لە جۆرێکی تایبەتی تیۆری زانین کردوە کە بەهەمموو کۆڕو کۆمەڵە زانستییەکانی





دنیای ناساندوه. جگه لەو باس و لێکۆڵینەوە زانستییانەی دەربارەی فیزیك و فیزیۆلۆجی هەستەکان دایهێناون و بلاۆی کردونەتەوە.

سیستەمی زانستی یاخود فەلسەفە بەگشتی کۆی ئەو بیرو بۆچوونانەیە پشت ئەستور بەبنچینەیەکی سەرەکی، مەنتیق ئاسا، دەستیاوی بەیەکەوە بەندن و لەنێو خۆیاندا ناکۆك بە یەکتری نین یاخود بەپێچەوانەی یەکترییەوە نین. ئەوەندەی لەکردن بێت، راست و رەوان وێنە ئاسا هەوڵی ڕەنگ ڕشتن و داڕشتنی مەلۆیەکی دیاردەکان ئەدات جا ئەم دیاردانە بابەت بن یاخود بیرو بۆچوون. لەم بوارەدا ماخ گرەوی بردۆتەوە. ئەو بابەتانەی کردوونی بە کەرەسەی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە زانستییانە بە چەند پیشەکییەك (دراو) کە لە سەرەتادا پێناسە و دیاریکراون دەستی پێکردوە و گەیشتۆتە ئەنجام کە مەنتیقییان لەو دراو یاخود لەو پێشەکییانە کەوتۆتەوە بەبێ ئەوەی لە رەوتی لێکۆڵینەوەکەدا هیچ ناکۆکییەك بەدەرکەوتبێ[٢٣].

ڕێکوپێکی و گونجان و دیسپلین و سیستەم نیشانەیەکی پوختەی ژیانی شارستانی مرۆڤ پێك دەهێنن. هەموو مرۆڤێك، بۆ نموونە، هەوڵ ئەدات لە ژیانی تایبەتی رۆژانەی خۆیدا، لە کردارو هەڵسوکەوتیدا بەگشتی و لەبیرکردنەوەیدا بەتایبەتی، ئەگەر بیرکردنەوەکە مەبەست و ئەنجامێکی دیاریکراوی هەبێ لە چوارچێوەی پرۆژەیەکی رەنگ بۆ ڕێژراودا جۆرە ڕێکوپێکی و مەنتیق و سیستەمێك بکات بەو چوارچێوەیەی بیرەکەی خۆی تیادا قاڵ و دابڕێژێ و لە هەموو جۆرە ناکۆکی و ناتەبایی و دژە بیرو بۆچوون بژای بکات.

٣- لە هەر قۆناغێك لە قۆناغە جۆربەجۆرەکانی فەلسەفەدا، فەیلەسوفێك وەك سوار چاك لە مەیداندا ئەسپی خامە رەنگینەکەی تاوداوە لەو چالاکی خامە تاودانەوە، سیستەمێکی ڕێکوپێك کەوتۆتەوە کە تیایدا وەك باخچە و گوڵزار گوڵی رەنگاو رەنگ و وەك دەریای روون و بێ گەرد چەندین گەوهەری پرشنگداری تیادا



بەدی کراون. هیوم سوارچاکێك بووە کە بە هەڵوێستەکەی بەرامبەر بە بنچینەی هۆیەکی بەتایبەتی و جەوهەر و ئیمپریزم بەگشتی وەك سوار چاکی قۆناغی خۆی بوونی کردەکی خۆی ساغ کردۆتەوە. دوور ناڕۆین ئەگەر بڵێین هەر لەسەردەمی ناوبراوەوە تا سەردەمی کانت و دواتریش هەردوو بنچینەی (هۆیەکی و بابەتی جەوهەر) ئەو دوو کێشەیە بوون کە مێشك و خامەی فەیلەسووف و زانا فەیلەسوفەکان جوانترین کاتی خۆیانیان بۆ داناون.

لە فەلسەفەدا هۆیەکی و بنچینەی هۆیەکی بەدوو بابەتی تاڕادەیەك لە یەکتری جیاواز دادەنرێن. لەکاتێکدا هۆیەکی وەك وشەیەك دادەنرێ کە واتای کەوتنەوەی قانونێك دەبەخشێ ئەوا بنچینەی هۆیەکی کاتێك پڕ مانا دەبێ واتە بڕ دەکات ئەگەر چەند بنچینەیەك لە ئارادابن روونی بکەنەوە کە هۆیەك یاخود چەند هۆیەکی دیاریکراو لەکات و شوێنی دیاریکراودا ئەنجامێك یاخود چەند ئەنجامێکیان لێ ئەکەوێتەوە.

ئەوی دەقەومێ هۆیەکی هەیە، هیچ رووداوێك بەبێ هۆکار روونادات. هیچ ئەنجامێك لەخۆیەوەو بەبێ هۆکار ناکەوێتەوە. هۆکاری تایبەتی و دیاریکراو هەمیشە ئەنجامی تایبەتی و دیاریکراوی لێ دەکەوێتەوە.... هتد.

هەر رووداوێك لە سروشتدا بقەومێ جۆرە گۆڕانێکی بەدوادا دێت. وشەی ئەنجام لێرەدا نەك هەر پڕ بەپێستە بەڵکو لەجیاتی ئەو گۆڕانە بەکاردێت. هۆکار جا هەر جۆرێك بێت، لە خۆیدا بابەتێکە لەپێش گۆڕانەکەوە دێت و هەموو کاتێك، لە چوارچێوەی رەوش و مەرجی دیاریکراودا، گۆڕانی دیاریکراوی بەدوادا دێت. بۆیە کێشەی هۆیەکی دوولایەنی دەبێ، یاخود وەك تەرازوو دوو تای هەیە:

- رووداوێك (ك) کە هۆکارە.

- قەوماوێك (ج) کە ئەنجامە.





لێك جیاکردنەوەی ڕێکوپێکی جۆرە بنەڕەتییەکانی هۆکارە جیاجیاکان لە فەلسەفەی ئەریستۆدا (٣٨٤ — ٣٢٢ پ.ز) دەبینرێ، بەتایبەتی کاتێك تیۆری ئیدیای ئەفلاتون رەخنە دەکات و بەم جۆرە بنچینەی هۆیەکی پێناسە دەکات:

((ئەوەی پەیدا دەبێ بەهۆی شتێکەوە پەیدا دەبێ و لە شتێکەوە دەکەوێتەوە وەك شتێك))[٢٤] کە دێتە گۆڕێ. ئینجا چوار جۆر هۆکار لە یەکتری جیادەکاتەوە:

- هۆکاری ماددی.
- هۆکاری فۆرمەکی.
- هۆکاری کاریگەر.
- هۆکاری ئەنجامەکی (مەبەست).

هۆکاری ماددی و فۆرمەکی هۆکاری ناوەکین و هۆکاری کاریگەر و ئەنجامەکی هۆکاری دەرەکین. لایەنی کەرەسەی بابەتەکە لە ماددەوە پەیدادەبێ. فۆرم کەرەسەکە بەجۆرێك دیاری دەکات کە بپرسێ بابەت چییە؟. واتە کەرەسەکە بەجۆرێك دیاری دەکات کە بەباتەکەی لە کەرەسەکانی تری وەك خۆی هەڵاوێرێ و جیابکرێتەوە. هەموو بابەتێك لە جیهانی پەیدابوون و لەناوچوندا دووچاری دەستی گۆڕانی جۆربەجۆر دەبێ. پەیدابوون و لەناوچوون لەم پرۆسەیە بەلاوەتر نییە:

شتێك فۆرمێکی پێ دەبڕێ کە پێشتر نەیبوە. یاخود فۆرمێکی لەدەست دەچێ کە پێشتر هەیبووە. فۆرمیش لە روخسارو وێنە بەولاوە نییە. ئەم پرۆسەیە ئەوەیە کە مرۆڤ لە ژیانی رۆژانەدا بە رووداو و قەومان ناوی دەبات. ئەریستۆ دا لەو باوەڕەدابووە هۆکاری ئامانجەکی هۆی تایبەتی و سەرەکی هەموو بوونێکە، بگرە هی هەموو رووداوێکە لە جیهانی واقیعیدا. ئەوەی رووده‌دات مەبەستێکی دیاریکراوی لە دواوەیە. پەیکەرتاش پەیکەرێك دادەتاشێ، مەبەستێکی



دیاریکراوی هەیە، وەك ئەریستۆ دەڵێ، بۆئەوەی نموونەی جوانناسی خۆی کە لە دڵ و مێشکیدا پەنگی خواردۆتەوە پیادە بکات.

دوای پایزی دوورو درێژ و ساردوسڕی سەدەکانی ناوەڕاست، هیوم (١٧١١ — ١٧٧٦) یەکەم فەیلەسوف بوو بابەتی هۆیەکی بە ڕێکوپێکی رەخنەکرد. پەرەی بە فەلسەفەی جۆن لوك (١٦٣٢ — ١٧٠٤)و فەلسەفەی بارکلی (١٦٨٥ — ١٧٥٣)دا و گەیاندنیە لوتکەی پەرەسەندنیان. بەلای هیومەوە پەیوەندی (هۆکار و ئەنجام) هیچ جۆرە کەرەکتەرێکی ناچارەکی نییە. واتە هۆیەکی بریتییە لە بەدوای یەکتری داهاتنی کاتەکی و لەیەکتری کەوتنەوەی بیرەکی. بۆچوونی هۆیەکی بۆچوونێکە لە دووبارەبوونەوەو لەگەڵ راهاتن و داب و نەریت کەوتۆتەوە. بەڕێکوپێکی بەدوای یەکتریدا هاتنی کاتەکی (زەمەنی) دیاردەکان وا تەماشا دەکرێن گوایە بەشێوەیەکی ناچاریی بەیەکەوە گرێ دراون ئەگەر یەکێکیان دەرکەوت چار نییە دەبێ یەکێکی تری بەدوادا بێت. خۆ ئەگەر مرۆڤ جوان لە شارەزایی (خیبرە) ورد ببێتەوەو رەوش و ناوەڕۆکەکەی شیبکاتەوە بڕیار دەدات کە لە ئەزموونەدا دۆخی (ب) هەمیشە دۆخی (ج)ی بەدوایدا دێت. هەروەها وا دادەنرێت کە دەبێ لە پاشە رۆژیشدا رەوشەکە هەر ئاوەها رووبدات. بۆ نموونە، ئێمە وامان دیوەو وامان هەست پێکردوە کە بەفرو سەرما هەمیشە کاتەکی بەیەکەوە بەندن، لەمەوە ئەو نەریتە بووە بەباو ئەگەر بەفر باری دەبێ سەرما بێت. بە واتایەکی تر: ئەگەر چەندین نموونەی وەك یەك دەرکەوتن، ئەگەر بابەتێك هەمیشە هەمان ئەنجامی لێکەوتەوە، ئەوکاتە مرۆڤ چەمکی هۆکارو بەیەکەوە بەسترانەوە دادەڕێژێ[٢٥]. بەڵام ئەگەر مرۆڤ بە چاوێکی وردبینانە تەماشای شتی دەوروبەر بکات بە بابەت و کەرەسە جۆر بەجۆریەکانیەوەو سەرنجی کاریگەریی هۆکار بدات ئەوا مرۆڤ ناتوانێ هەبوونی بەیەکەوە بەسترانی ناچارەکی یاخود پێکەوە گرێدانی ناچارەکی پشتڕاست بکاتەوە. ئەگەر بوترێ دوو رووداو هۆیەکییانە بەیەکەوە بەستراون مانای ئەوە نییە کە لە





واقیعدا فاکتەری هۆیەکی هەیە بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە جۆری بیرکردنەوەی مرۆڤ وایە لە بیردا ئەو جۆرە پەیوەندی و بەیەکەوە بەسترانە دەدۆزرێتەوەو مرۆڤ وا هەست پێ ئەکات، یاخود لەبیرکردنەوەدا ئەم جۆرە بەیەکەوە بەسترانە پیادە دەکات و ئیتر دەگاتە ئەو ئەنجامەی گوایە ئەم پەیوەندییە لەنێو شتەکاندا هەیە. ئەوی راست بێ هیوم وتەنی ناچارەکی شتێکە تەنیا لە مێشکی مرۆڤدا هەیە نەك لەنێو کەرەسە و بابەتەکانی دەوروبەردا. ئەقڵی مرۆڤ لە توانایدا نییە بەشێوەیەکی پێشیانە و لە چەمکەکان بەیەکەوە بەسترانەوەیەکی هۆیەکی ساغ بکاتەوە بۆیە، ئەو رایەی دەڵێ: هەر بابەتێك لەکاتی پەیدابوونیدا، پەیدابوونەکەی لە هۆیەکەوە کەوتۆتەوە، پشت ئەستور بە سەلماندن و زەین روونیی، دڵنیایی لێ ناکرێت(٢٥).

بیرو بۆچوونەکانی هیوم بەگشتی و هەڵوێستەکەی بەرامبەر بە هۆیەکی بەتایبەتی لەلایەن ئێرنست ماخ و لۆرد بێرتراند رەسڵ و رێبازی کۆڕی ڤیەننا وە پشتگیرییان لێکراوە.

ئێرنست ماخ کە فەلسەفەی ئایدیالیستی بارکلی کاری تێ کردوە، ئەرکی سەرشانی خۆی لەوەدا دیوە، بەهۆی شیکردنەوەو تاووتوێکردنی هەستەکان چەمکی شارەزایی (خیبرە) لە هەموو شوێنەوارو پاشماوەیەکی میتافیزیك بژار و بێ گەرد و پاك بکاتەوە. چەمکی هۆکار و ئەنجام لە چەند وێنەیەك بەولاوە نین کە شارەزایی مرۆڤ و سەرنجدان دروستیان کردوون و هیچ بەرامبەرێکیان لە جیهانی دەوروبەردا نییە.

هایزنبێرگ و ماکس بۆرن لە سەدەی بیستەمدا لە دوو هەڵوێستی زانستییانەدا رەخنەکردنی هۆیەکییان خستە بارێکی ترەو بگرە دەکرێ بوترێ بە لایەکی تریاندا شکاندەوە.

هایزنبێرگ کێشەی هۆیەکی «بە پەیوەندییەکی تەمومژاوی درشت و دژوار) و ماکس بۆرن کێشەکەی بە (بێ مانا و پوچ) داناوە. هایزنبێرگ وتویەتی: قانونی هۆیەکی دەڵێ: ئەگەر مرۆڤ بەتەواوەتی ئێستا بزانێ و شارەزایی لێ هەبێ دەتوانێ






پاشەرۆژ پێشبینی بکات.. ئەمە هەڵەیە. چونکە هیچ کەسێك لە توانایدا نییە بە تەواوەتی ئێستاکە بە کوڵك و پێستەوە بزانێ(٢٦). لە هەمان لاپەڕەدا پتر دەڵێ:

لەبەرئەوەی هەموو تاقیکردنەوەکان پابەندی قانونەکانی میکانیکی کوانتەمن و پابەندی ئەم هاوکێشەیەن:

ΔE. Δt ≥ h bzw. Δp. Δq ≥ h.

بۆیە بەهۆی میکانیکی کوانتەمەوە کارنەکردن و بڕنەکردنی قانونی هۆیەکی بەتەواوەتی بەلایەکدا خرا و ساغ بۆوە.

ماکس بۆرن، کە تارادەیەك سەرگەرمی هەمان بابەت بووەو دڵنیابووە لەوەی کە لە جیهانی ئەتۆمدا پێودانگەکانی فیزیك وەك پێوەرێك بەشێوەیەك کە لەژێر کۆنترۆڵ بچێتە دەرێ کار لە بابەت و کەرەسەی پێوانەکە دەکەن. هەروەها لەو باوەڕەدابووە، ئەگەر چی تەکنیکی تاقی کردنەوەکان ئەوپەڕی تەواو و پێشکەوتوو و پەرەسەندوون بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا لەو رادەیەدا نین بتوانن رەوش و دۆخی سیستەمێکی زانستی بە هەموو کەلەبەر و وردەکارییەکانیەوە باس بکەن و بخەنەڕوو. سروشت خۆشی لەخۆیدا کۆسپ دەخاتە بەردەم بۆیە: «لە توانادا نییە هەموو وردەکارییەکی رەوشێك بە تەواوەتی بپێورێ و ئەمەش کۆسپە لەبەردەم دیاریکردنی رەوتی ئایندەی(٢٧) کار و پرۆسە و بەرەوپێش چوونەکەدا. لەمەوە دەکەوێتەوە: بنچینەی هۆیەکی بەواتا باوەکەی، هەموو مانایەك دەدۆڕێنی و لە دەست ئەدات.

هیچ گومان لەوەدانییە کە ئەم دوو لێکۆڵەرەوە دوو سوارچاکی گۆڕەپانی زانستی سەدەی بیستەمن، بە توێژینەوەکانیان خەرمانی زانستی شارستانی مرۆڤیان بە بڕشت و بەپێزتر کردووە. بەلاّم ئایا هەردووکیان باسی بنچینەو قانونی هۆیەکی یان کردووە؟ ئایا دەکرێ ئەوەی لە جیهانی تایبەتی زانست و لابۆر و تاقیگادا روودەدا بەسەر جیهانی ئاسایی ژیانی رۆژانەی مرۆڤدا بسەپێ و پیادە بکرێت؟

هیچ لاریی لەوە نییە کە زانست گومان لە بوونی بابەت و کەرەسەکانی خۆی ناکات و بە هەبوو دایان دەنێ و سەرگەرمی ئەو لێکۆڵینەوەیە نییە، ئایا چۆن لێکۆڵەرەوە بەگشتی زانینی دەربارەی «بابەت و کەرەسە دەستگیر دەبێ»(٢٨) وەك ئەمە لە فەلسەفەدا باوە، ئەو ئەنجامانەش کە لێی دەکەونەوە لەپێشدا لە جیهانێکی تایبەتیدا (لابۆر — تاقیگا) بەدەست هاتوون. دوور نییە، تارادەیەکی زۆر بڕکردن و کاریگەریی و دەستبەکاری ئەم ئەنجامانە، بەپێی بیری فەلسەفە، لە چوارچێوەی ڕێتێچوون نەچنە دەرەوە. فەلسەفە و جیهانەکەی و ژیانی ڕۆژانەی خەڵك زۆر لە تاقیگاکانی زانست جیاوازتر و فراوانترن. دەبێ چۆن بشێ باسی زانینی بێ گەرد و ڕاست و دروست بکرێت کە دان بە بوونی پەیوەندی نێوان هۆکارو ئەنجامدا نەنرێ. ئەگەر لە ڕوانگەی دەروونی (سایکۆلۆجی)یەوە بنەمای هۆیەکی، بنچینەیەکی پتەو و دڵنیایی لێکردنی نەبێ، ئەوا لە ڕوانگەی مەنتیق و فەلسەفەوە کێشەکە بە جۆرێکی تر دێتەبەر دیدە و هۆش. هیچ کاتێك ئەو قسەیەی دەڵێ، خۆرهەڵاتن و گەرمبوونی بەردی ئەم دۆڵ و دەشتە پەیوەندییەکی هۆیەکییان بەیەکەوە نییە وا بە ئاسانی ناچێتە مێشکەوەو ژێر نایگیرێ.

دوور نییە لێرەدا بوترێ تیۆرییەك، تێزەیەك، گریمانەیەك کاتێك ڕەوا دەبێ ئەگەر بەهۆی مەنتیق پشتڕاست کرایەوە یاخود بەهۆی پەیڕەوی ئەزموونەکی (ئیمپری) ساغ بۆوە. هۆیەکیی وەك پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و ناچارەکی بەهیچ کامێك لەم دوو پێودانگە ساغ و سور ناکرێتەوە. لاری لەم قسەیە نییە، بەڵام دیوەکەی ئەولای هەمان قسە ڕەوایە، واتە بەهیچ کامێك لەم دوو لایەن و پێوانەیە ناتوانرێ بەشێوەیەك دڵ ئاو بخواتەوە نابوون و نا کاریگەریی و نابووتی ئەم پەیوەندییەی نێوان دوو شت وەك هۆکار و ئەنجام ساغ و پشتڕاست بکرێنەوە. کانت وتەنی مەرجی دەستگیربوونی زانین و شارەزایی هەبوونی بنچینەی هۆیەکییە کەوابوو هیچ کاتێك شارەزایی (خیبرە) ناتوانێ بنچینەی بوونی خۆی پووچەڵ بکاتەوە. بە



واتایەکی تر: هۆش و جیهانی شت لە خۆیاندا کە ناوەڕۆکی هۆش پێك دێنن، بەبێ ئەم جۆرە پەیوەندی و پێکەوە بەسترانەوەیە کە بەشێوەی تۆبزی و ناچارەکیی، بەیەکەوە هاتن، یاخود بەدوای یەکتریدا هاتن دەردەکەوێ ناکرێ و ناشێ و بە بیرومێشکدا نەیەت. ئیتر ئەمە دەری دەخات بۆیە ئەم بنچینەی هۆیەکییە — بەیەکەوە هاتن یاخود بە دوای یەکتریدا هاتن — ڕەوایە و دەست بەکارە(٢٩). لەم بوارەدا قسەیەکی ئەلبێرت ئاینشتاین دێتەوە یاد کە تیایدا پەیوەندی ماتماتیك و دەوروبەر (واقیع) باس دەکات کە وەك دوو بوار و مەیدان و مەڵۆ، دوو لایەنی لە یەکتری جیاواز و سەربەخۆن. ئاینشتاین وتویەتی:

چەندە ڕستەکانی ماتماتیك پەیوەندییان بەدەورو بەرەوە هەبێ ئەوەندە جێگای گومان و دڵنیایی لێ نەکردنن. خۆ ئەگەر گومان لە ڕستەکانی ماتماتیك نەکرێ جێگای دڵنیایی بن ئەوا پەیوەندییان بە واقیعەوە نییە(٣٠).

ئەم قسەیەی ئاینشتاین ئەگەرچی لە بۆنەی تایبەتدا و دەربارەی بابەتێکی تر وتراوە بەڵام هیچ گومان لە ڕاستییەکەی ناکرێ. ماتماتیك وەك کارێکی بیرو زانست هیچ پەیوەندی بە دەوروبەرو واقیعەوە نییە. خۆ ئەگەر ناچار کرا پەیوەندی بەواقیعەوە هەبێ ئەوا ماتماتیك نامێنێ لەوەدا کە ڕستەکانی ڕاستیی و دڵنیایی دەدۆڕێنن. ئەم ڕایە بەپێی بۆچوونی من بەجۆرە مشتوماڵ کردنێکەوە دەکرێ لە گۆڕەپانی بنچینەی هۆیەکییدا پیادەبکرێت. شارەزایی و هۆش و بیری مەنتیقی بەندن بە بنچینەی هۆیەکییەوە گومان کردن لەم بنچینەیە، هۆش و بیرو شارەزایی بەگشتی لە مەنتیق و ئەنجامی مەنتیقیانە بێ بەش دەکات.

بەڵگەیەك ڕاستی ئەم قسەیەمان پشت ڕاست دەکاتەوە هەڵوێستە سەلەفییەکەی ئەبو حامیدی ئەل غەزالییە بەرامبەر بە قانونی هۆیەکی.

ژیر و ئەقڵ یاخود بڕوا و ئیمان؟ ئەگەر ژیر بکرێ بەسەر پشك ئەوا ناکرێ مرۆڤ دەستبەرداری هۆیەکی ببێ، چونکە هەموو پرۆسەیەکی ژیرەکی، لە دراوەوە تاوەکو ئەو ئەنجامەی لێی ئەکەوێتەوە بەندە بە بنچینەی هۆیەکییەوە. گومان و دڵ کرمێ بوون لە بوونی پەیوەندی ناچارەکی نێوان هۆکار و ئەنجام گومانکردن لە ژیرو توانای ژیرو ئەو ئەنجامانەی لە پرۆسەی دەست بەکاربوونی ژیر و چالاکییەکانی دەکەونەوە. پووچەڵکردنەوەی بنچینەی هۆیەکی هەڵتەکاندنی ئەو بنەڕەتەیە کە وەك مەرجی بنەرەتی شارەزایی و فام و ژیر لەسەری بەندن.

ئەگەر بڕوا و ئیمان هاتنە پێشەوە ئەوا کێشەکە روخسار و ناوەڕۆکێکی تری پێ دەبڕێ و بە بارێکی تردا دەشکێتەوە. ئەل غەزالی بۆ ئەوەی پاکانە بۆ هەڵوێستێك بکات کە بە هیچ جۆرێك بە ئەقڵ و ژیر و مەنتیق پاکانەی بۆ ناکرێ، دەڵێ: هۆیەکی بەند نییە بە پەیوەندییەکی ناچارەکی، مەرج نییە هەمیشە هۆکار و ئەنجام بەیەکەوە بن یاخود دووەم بەدوای یەکەمدا بێت و لێی بکەوێتەوە. بەڵگەی ئەبو حامید لەم بوارەدا ئاگرە. ئاگر هۆکاری گەرمکردن و سوتاندنە، بەڵام مەرج نییە هەموو کاتێك سوتان لە ئاگر بکەوێتەوە. وەك سەرچاوە ئاینیەکان باس دەکەن — غەزالی وتەنی — مرۆڤێك فڕیدراوەتە ناو ئاگرەوە کەچی نەسووتاوە. چونکە فەرمان بە ئاگرەکە کراوە سارد و بێ زیان بێ (یا نار کونی بەردەن و سەلامەن). ئەمە مانای ئەوەیە پەیوەندی نێوان هۆکار و ئەنجام بەهیچ جۆرێك پشتڕاست و پتەو و ناچارەکی نییە. لێرەدا باسی ئەو هۆیەکییە نەکراوە کە بنچینەکەی ئەقڵ و ژیر و مەنتیقە، بەڵکو هەرسێکیان لادراون بۆ ئەوەی بڕوا و ئیمان لە جێگایان دابنرێ. لەم کاتەدا سەیر نییە ئەگەر بوترێ ئاگر، هۆکار، ئەرکی سەرەکی خۆی دەدۆڕێنی و چاوەڕێی دەکات فرمانی پێ بدرێ و ڕێگای بدرێ ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ بهێنێ. هۆیەکیی بنچینە و بنەڕەتی بڕیاردان و ئەنجامگیریی و بیرکردنەوەی ژیرەکییە ئەگەر ئەم بنچینەیە هەڵتەکێنرا ئاساییە پەنا ببرێتە بەر شتێکی تر کە



نە بە ئەقڵ و نە بە مەنتیق رەوا و پاکانەی بۆ ئەکرێت. بۆیە دەوترێ، ئەو زەبروزەنگە، ئەو دیکتاتۆرییەی لە بڕواو ئایدیۆلۆجی و لاهوت.... دەکەوێتەوە کەمتر نییە ئەگەر پتر نەبێ لەو زەبروزەنگەی دەسەڵاتی سیاسی لە رۆژهەڵاتدا بەسەر کۆمەڵدا پیادەی دەکات. ئەگەر غەزالی دوور لە خێوی دەسەڵاتی بڕوا زانستیانە (بەپێ سەردەمی خۆی)، نەك لە چەند بنچینە و پێشەکییەکی دۆگما (بڕوا ئاسا)وە بیری بکردبایەوە و کێشەکەی تاوتوێ بکردبایە، بێ سێ و دوو لێ کردن دەگەیشتە ئەنجامێکی تر بەڵام چارەنووسی لە هی ئبن روشد چاکتر نەدەبوو!

بڕواو ژیر دوو سەرە جەمسەر، دوو فاکتەری لە یەکتری جیاوازن. بڕوا وەك هۆکار و فاکتەر جۆرە دڵنیاییەکی دەروونیی ناوەکی بە مرۆڤ دەبەخشێ بەرامبەر بە ترسێك کە هۆکار و سەرەتا و کۆتاییەکەی تەمومژاویی و نادیارە، تەنانەت ژیان خۆی کە کۆتاییەکەی نادیارە مایەی ئەم جۆرە ترس و نارەحەتی و سەخڵەتی و پەشێوییەیە. بۆیە پتر —لەم رەوشەدا- پەنا دەبردرێتە بەر بوونەوەرێك — هێزێکی ترانسندێنتی — لە سروشت بەدەر کە لە زمانە جیاکانی جیهاندا ناوی جۆربەجۆری بۆ داهێنراوە. ئەم هەڵوێستە چەندین نیشانە و کێلی بە بەردێك پێکاوە، ئەوەی لێرەدا بەرچاوە، پاکانەکردنیەتی بۆ زۆر و جەور و زەبروزەنگ و نەخۆشی و دەرد و بەلا و نا لەباریی رێژیم و سیستەمە زۆردارەکان لەوەدا کە هەموو جۆرە ئۆبالێك وەلادەنێ و بەرپرسی نامێنێ، چونکە هەموو شتێك چارەنووسە! ئەوی دەقەومێ و روودەدات ئەو باشە! هۆیەکەشی بەتەواوەتی دەستنیشان نەکراوە. بەپێچەوانەوە ژیر هێز و توانا و چالاکییەکی تایبەتی مرۆڤە کە بوونەوەرێکی ژیرە، ئامرازێکە بۆ بیرکردنەوەی رێکوپێك، بڕیاردان، ئەنجامگیریی راست و دروست و رەوان، ئەنجامگیرییەك وەك پرۆسەیەکی ژیریی هیچ جۆرە ناکۆکی و ناتەباییەك لەرەوتی پرۆسەی نێوان پێشەکی بڕیارەکەدا کە بریتی‌یە لە دراو و لەنێوان ئەنجامەکە وەك داواکراو نەیەنە گۆڕێ و دەرنەکەون.





ژیان و جیهانی ئەم سەرزەمینە بابەتی ژیرن بۆیە هۆکاری راستەقینە دەدۆزرێتەوەو دەردەکەوێ بەرپرسیی و ئۆباڵ دەکەوێتە چ ئەستۆیەك. ئەمەیە مەبەست لەو پێناسەیەی ژیر کە دەکرێ و دەڵێ: ژیر توانای دەرهێنانی تایبەتە لە بنەڕەتی گشتی و هەمەکیدا. رەتکردنەوەی بنەمای هۆیەکی، پەیوەندی نێوان هۆکار و ئەنجام ئەگەر لە زانستدا ئەنجامی لە باری هەبووبێ ئەوا پتر ئەو ئەنجام و دەستبەکارییە لە جیهانی تایبەتی و تەنگەبەری زانست و لابۆر و تاقیگادا بوون. پەکخستنی هۆیەکی لە لاهوتدا، بەتایبەتی لە مەسیحیەتدا بە مەبەستی پاکانە کردن بووە بۆ زوڵم و زۆرو جەورو ناعەدالەتی. زۆردار وەك بەرزەکی بانان بێ ئارەقە بۆی دەرچووەو زۆر لێ کراو وەك قۆچی قوربانی دەم کوت کراوە. چونکە هیچ جۆرە پەیوەندییەکی هۆیەکی لەنێوان هەردوولا لایاندا ساغ نابێتەوە! بانێکە و دووهەوا.



## پەراوێزەکان

1- Russell, B. Einfuehrung in die mathematische Philosophie. Darmstadt…. S. 21.

2- Kraft, V. Der Wiener Kreis. Wien 1968. S1. ff.

Reiniger, R., 50 Jaher philosophische Gesellschaft ander Universtiaet Wien. 1888 – 1938. S. 5 ff.

3- Der Wiener Kreis., Wissenschaftliche Weltauffassung. (Hrsg) von V. E. Mach. Wien 1929. S. 13.

٤- هەمان سەرچاوە بە ئەڵمانی ل:١٩.

٥- بڕوانە باسەکەی کارناپ ((مەنتیقی کۆن و نوێ)) لە کۆتایی ئەم کتێبەدا. (تێکستی هەڵبژاردە).

6- Neurath, otto., Protokollsaetze. In: Erkenntnis, Bd. 2 Leipzig 1932. 209 ff.

7- Carnap, R., Schein probleme inder Philosophie. 1966. S. 15.

8- Wittgenstein, L., Traktatus Logiko – philosophikus. Fran kfurt a/M. 1960. p. 6. 1- 6. 11.

9- Boltzmann, L., Populaere Schriften. 3. Aufl. Leipzig 1925.

10- Mach, Ernst., Die Analyse der Empfindungen. Darmstadt. 1978. S. 17 ff.

11- Waismann, F., Wittgenstein u. d. Wienerkreis. Stw. 503.

12- Hahn, Hans., Die Bedeutung der Wissenschaftlichen Weltauffassung insbesonder für Mathematik-u. Pysik. In: Erkenntnis. Bd I. Leipzig 1930-1931. S. 96.

13- Erkenntnis. Bd. I. S. 89 ff.

14- Erkenntnis. Bd. 4. S. 311 ff.





15- Erkenntnis. Bd. 5. S. 407 ff.

16- Erkenntnis. Bd. 6. Leipzig 1936. S. 275.

17- Heisenberg, W., Der Teil u. das Ganze. München 1969 S. 279 – 280.

18- Kolakowski, Leszek., Die Philosophie des Positivismus. München. 2 Auflage. 1977. S. 140.

19- Mach, E., Die Mechanik. Historisch – Kritisch dargestellt Darmstadt 1982. S. 459.

٢٠- وشەی ئابووری کە لێرە خستومەتە نێو کەوانەوە مەبەست لەو بنچینەیە کە لە فەلسەفەی ماخدا بە بنچینەی ئابووری Oekonomie prinzip ناسراوەو لە هەموو زمانە ئەوروپاییەکاندا وەك خۆی بەکاردێت. مەبەست لەم بنچینەیە ئەوەیە کە زانست بابەتەکانی بە کورتی و سادە و پوختی باسبکات و لە بەکارهێنانی چەمك و گریمانە و ڕستەدا دەست بلاّو نەبێ.

٢١- ماخ، شیکردنەوەی هەستەکان. بە ئەڵمانی ل: ٥١.

٢٢- کانت: ڕەخنەکردنی ژیری بێگەرد بە ئەڵمانی. ب. (١٣٢). لە فەلسەفەی کانتدا چەمکی ترانسندێنت و ترانسندنتال دوو مانای جیاوازیان هەیە. یەکەمیان مەبەست لەو زانینەیە کە لە سنوری ئەزموون و شارەزایی (خیبرە) و هوش تێدەپەڕێ بەرەو سەر. دووەمیان ئەو پرۆسەی زانینە کە خۆی وتەنی جاران هۆشی مرۆڤ و هەستەکانی پابەندی بابەتی دەورو بەربوون لەمەولا و لە فەلسەفەی کانتدا دەبێ شت و بابەتەکان پابەندی هۆش و هەست و بیری مرۆڤ بن. واتە مرۆڤ سەرپشکە.

٢٣- ئەوی لەم بوارەدا فەلسەفە لە زانست جیادەکاتەوە، زانست لە سەرەتادا گریمانە و دراو و داواکراو پێناسە دەکات. فەلسەفە ئەم ئەرکە لە کۆتاییدا پیادە ئەکات.

24- Aristoteles., Metaphysik. Berlin 1990. B7. K.7 – 12.

25- Hume, D., Ein Traktat ueber die menschliche Natur. Hamburg. 1973. S. 109.



26- Heisenberg, W., Ueber den an schaulichen Inhalt der quanten theoretischen Kinematik u. Mechanik. In: Zeitschriftf. Physik. Bd. 43. Berlin 1927. S. 172.

27- Born, Max., Ueber den Sinn der Physikalischen theorien. In: Die Naturwissenschaften 17. Jg. Berlin 1929. S. 9.

28- Buzello, Herbert., Kritische Unter Suchungen von Machs Erkenntnis theorie. Neuedruck Wuerzburg 1970. S. 18.

29- Lucka, Emil., Das Erkenntnis problem… In: Kant – Studien. Bd. 8. Jg. 1903. S. 407.

30- Einstein, A., Geometrie u. Erfahrung. S. 2. Sit zungs berichte d. preussischen Akademie d. Wissenschaften. Wieder abdruck durch Akademie Verlag Berlin – DDR. 1978.





## (٢)

## له میتافیزیکەوە بۆ زانینی زانستییانە

لەنێو هەمەجۆریی و فرە ڕەنگیی فەلسەفەی سەدەی بیستەمدا، ئەگەر بەچاوێکی بابەتییانە تەماشا بکرێت، سێ ڕێبازی سەرەکی دەبینرێن، هەرسێکیان بەگشتی لە فەلسەفەی کانتەوە سەرچاوەیان گرتووە، ئینجا بەشێوەیەك لە شێوەکان پەیوەندییان بە ڕێبازە فەلسەفییە زانستییەکەی ئێرنست ماخەوە هەبووە، نەك هەر لە ئەڵمانیادا - ئەگەر چی بەرهەمەکان بە ئەڵمانی نووسراون- بەڵکو لە سەرانسەری ئەورووپا و ئینگلتەرە و دوای جەنگی دووەمی جیهان تاڕادەیەك لە ئەمەریکا خەت و خاڵیان بە تەوژمی فەلسەفەی سەردەمەکە داوە، ڕوخسار و ناوەڕۆکیان ڕەخساندووە.

یەکەم: کانتیانیزمی نوێ، بەتایبەتی ڕێبازی ماربۆرگ بە بڵاوکراوەو بەرهەمە فرە ڕەنگیەکانیەوە، بە ڕابەرایەتی هێرمان کۆهن، پاول ناتۆرپ، هانریش ریکێرت و...هتد.

دووەم: فینۆمێنۆلۆجی ئیدمۆند هوسەرل و هەردوو کۆڕپەکەی کە ماڵی خۆیان کردووە و تارادەیەك سەربەخۆن:

- ئیکزیستیانتیالیزمی ئەڵمانیا (هایدیگەر، یاسپەرز... هتد). لقی فەرەنسایی (سارتەر، گابریال مارسێل... هتد).

- هێرمێنۆیتیك. (ڤیلهلم دیلتیی و...).

سێیەم: ڕێبازی پۆزیتیڤیزم و ئەو ڕووبارانەی لێی جیابوونەوە بەتایبەتی فەلسەفەی شیکردنەوەی مەنتیقی زمان، ئەزمووونی مەنتیقی و هتد.



ئەوی لێرەدا مەبەستی ئەم نووسینەمانە فەلسەفەی ئەزموونی مەنتیقییە کە لەسەرەتادا لە ڤیەننا سەری هەڵدا، بەتایبەتی فەلسەفەی کارناپ لەو بەرهەم و بڵاوکراوە جۆربەجۆرانەیدا پێش کۆچ بارکردنی و بەجێ هێڵانی وڵاتەکەی بە زمانی ئەڵمانی بڵاویکردونەوە. بۆ پشتڕاستکردنەوەی بۆچوونەکەمان کە —کانت سەرچاوە بووە- هەوڵ ئەدەین لە سەرەتا وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە: کامەیە ئەو لایەنەی فەلسەفەی کانت کە هاندەری سەرلەنوێ پەیدابوونەوەی فەلسەفە بووە، کاری لە فەلسەفەی کارناپ و فەلسەفەی ئەزموونی مەنتیقی کۆڕی ڤیەننا کردووە؟ بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە کە لە خۆیدا وا سووك و ئاسان نییە، ئەگەر بۆمان بکرێ، گەشتێك بەنێو جیهانی دوو ڕێبازی فەلسەفەدا دەکەین کە لەدوو سەدەی جیاوازدا پەیدابوون، یەکێکیان (کانت) لە سەدەی هەژدەهەم و دووەمیان (کارناپ) لە سەدەی بیستەم. بەڵام هەردووکیان ئەڵمانیی و بەو زمانە شتیان نووسیوە. دوو سەدە کە بەراستی جۆرە وەرگەڕان و بارگۆڕینێکیان لە ڕەوتی بزوتنەوەی بیری فەلسەفەدا پیادە کردووە. کانت لە سەدەی ڕۆشنبیریدا شۆڕشی کۆپەرنیکی لە فەلسەفەدا بەرپاکرد، دژی ئەو تەوژمە وەستا کە دەیویست ژیر بپەرستێ. لەوەدا ژیری وەك هێزو توانا و فاکتەرێك خستە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو ڕەخنەوە. لە پێشەکی چاپی یەکەمی کتێبی ڕەخنەکردنی ژیری بێگەردا کانت بۆ ڕوونکردنەوەی هۆی هەڵبژاردنی ئەو ناوە بۆ کتێبەکەی وتویەتی:

من وا لەرەخنە ناگەم کە بریتی بێ لە ڕەخنەکردنی کتێب و سیستەم، بەڵکو مەبەستم ڕەخنەکردنی هێز و توانای ژیرە بەگشتی، لەوەدا کە بەبێ پشت بەستن بە شارەزایی هەوڵی زانین ئەدات[1]. لە هەمەوو کارو چالاکییەکدا مرۆڤ پێویستی بە ئامرازێك هەیە بۆ ئەنجامدانی کارەکەی. کانت ژیر ڕەخنە دەکات، دەبێ ئەو ئامرازەی پشتی پێ دەبەستێ بۆ ئەم ڕەخنەکردنە چی بێت؟ هەردەبێ ئامرازەکە ژیر خۆی بێت. باشە دەکرێ ئامرازێك لە هەمانکاتدا دوو کار بکات، دوو ڕۆڵ بگێڕێ. بەواتایەکی تر ژیر، بەو





ڕەخنەکردنە دووچاری جۆرە دادگایکردنێك بووە ئەبێ دادوەر (قازی) هەر ئەقڵ خۆی بێت یان نا؟ چۆن دەنگونجێ مرۆڤێك لە یەك کاتدا تاوانبار و قازی بێت؟

هەڵوێستی کانت بەرامبەر بە میتافیزیکی کلاسیك و تێکەڵکردن و پێکەوە بەستنەوەی هەردوو تەوژمی فەلسەفەی ئەزموونی و ئایدیالیستی لە فەلسەفەکەیدا و بۆچوونەکانی لە بواری تیۆری زانیندا ئەو لایەنانەن کە لە فەلسەفەی سەدەی بیستەمدا بە ئاشکرا ڕەنگیان داوەتەوە جا بە لەبار و پەسندکردن بێ یاخود نالەبار و ڕەتکردنەوە بووبێ. هەموو بیرو بۆچوون و فەلسەفە و ئایدیۆلۆجییەك، ڕاستە، کۆرپەی ئەو کەشوهەواو دەوروبەرەن کە تیایدا سەریان هەڵداوە، بەڵام ئەم بڕیار و دان پیادانانە بەهیچ جۆرێك لە کاریگەریی و ڕۆڵ و دەستبەکاریی فەیلەسووف و ئایدیۆلۆجیست و خاوەن بیر کەم ناکاتەوە، ئەگەر ئەو خاوەن خامەیە بە بیروبۆچوون و بەرهەمەکانی ڕەسەنیی خۆی ساغ کردەوە. لە کوردەواریدا باوە —لە کەشوهەوا و دەوروبەری ئایین پەروەردا زۆرجار مرۆڤی گۆمڕا پەیدا دەبێ!- مرۆڤ پابەندی دەوروبەرو هۆکارە جۆربەجۆرەکانە بەڵام نەك بەندە ئاسایی. هەر مرۆڤە توانیویەتی ڕەنگی دەوروبەرو کۆمەڵ و سروشت بڕێژێ و ئاغایانە کۆنترۆڵیان بکات. کانت، ئەگەر ئەو دەوروبەرە بهێنرێتە بەرچاو کە تیادا پێ گەیشتووە، ڕاستی ئەم قسەیە ساغ دەکاتەوە.

بە دەگمەن ڕێبازێك لە ڕێبازەکانی فەلسەفەی سەدەی بیستەم لە ئەوروپادا دەبینرێ ئەگەر بەجۆرێك لە جۆرەکان پەیوەندی بە فەلسەفەی کانتەوە نەکردبێ، هەر لە پەرەپێدان و بژارکردن و پەسندکردنەوە تاوەکو ڕەتکردنەوەو ڕەخنەکردن و هێرش بردنە سەر... کانت لەسەردەمێکدا ژیاوە دوو ڕێبازی جیاواز لە کۆڕو کۆمەڵە و کەشە ئەکادیمیاییەکاندا باو و دەست بەکاربوون:

- بزوتنەوەی ڕۆشنگەری Aufklaerung.

- فەلسەفەی ئەزموونیی ئینگلیز.



بزوتنەوەی روناکبیریی لە سەدەی هەژدەهەم لە ئەوروپا پەیدابووە و بڵاوبۆتەوە، لە سەدەی نۆزدەهەم لە بەرامبەر هێرشەکانی بزوتنەوەی ڕۆمانتیکیدا دامودەزگاکانی پێچاوەتەوەو مەیدانی چۆڵ کردووە. کانت دەڵێ، روناکبیریی قوتاربوونە لە سەردەمی منداڵی و هەنگاونان بەرەو سەربەخۆ بوون و خەت و خاڵ دان[٢]. کانت سەردەمی منداڵی بەوە داناوە کە ئەو کاتە مرۆڤ —خاوەن خامە- لە توانایدا نەبووە، بەبێ فاکتەرێکی تر سوود لە هێزو توانای ژیرو فام وەربگرێت. ئەم دۆخە نالەبارە وەك پاشماوە و میراتێك کە ئەوپەڕی سەخت و گران بووە لەسەدە دوورودرێژ و ساردو سڕەکانی ناوەڕاستەوە ماوەتەوە، کە تیایاندا مرۆڤ وەك ئامراز تەماشا کراوەو سروش سەرچاوەی ڕاستەقینە بووەو ژێر پاشکۆیەکی بێ نازی سروش بووە. ئەم بزوتنەوەیە لە بڕیارو حوکمداندا بڕوای بە توانای ژیرو فامی مرۆڤ هەبووە وەك ئامرازێکی سەرەکی و سەرپشك بۆ زانینی هەموو ئەو کاروبارانەی توندوتۆڵ پەیوەندییان بە کون و کەلەبەر و نهێنییەکانی ژیان و کۆمەڵ و جیهانی دەوروبەرەوە هەیە. ڕەخنەکردن و شیکردنەوە مۆرکی فەلسەفەی ڕۆشنگەری بوون. واتە ڕەخنەکردنی ئایین[٣] و زانین و ڕێژیم و سیستەمە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانی سەردەمی خۆی، ئینجا شیکردنەوەی زانینی مرۆڤ و تیشك خستنە سەر کەرەسە و بابەتە جیاکانی بەو مەبەستەی بنچینەیەکی پتەوی دڵنیایی لێکراو دابنرێ بۆ ئەوەی ڕەنگی کۆشکی زانینی مرۆڤ و زانست لەسەری دابرێژدرێ.

ژێر یەکەیەکی لە گۆڕان نەهاتووە. ئەم بۆچوونە ئەو ئەنجامەی لێ کەوتۆتەوە، ژێر لە توانایدا هەیە وەڵامی هەموو پرسیارێك بداتەوەو لەوەش پتر ئەو زانستەی لە ژێر دەکەوێتەوە دەتوانێ جێگای ئایین بگرێتەوە و ئەرکەکەشی بگرێتە ئەستۆی خۆی کە بریتییە لە دڵنیاکردنی مرۆڤ و ڕەواندنەوەی ترس و نائومێدی. هەندێك لە ڕابەر و لایەنگرانی ئەم بزوتنەوەیە ئەوەندە ڕێزیان لە ئەقل ناوە تا ئەو سنورەی بڕوابوونیان بە ئەقڵی مرۆڤ لە جێگای ئەو بڕوایە داناوە کە مرۆڤی عیسایی بە ڕەب هەیبووە[٤].





- فەلسەفەی ئەزموونی ئینگلیز ئەو فەلسەفەیەیە کە جۆن لۆك (١٦٣٢ – ١٧٠٤ز)، دێڤید هیوم (١٧١١ – ١٧٧٦ز) ڕەنگیان ڕشتوە. فەلسەفەی شیکردنەوەی زانین و بەدواچوون و قوڵبوونەوە لە زانیندا تا دەگاتەوە سەر بنچ و بناوانی. ئەو ڕەخنەیەی هیوم لە بنچینەی هۆیەکی گرتی جارێکی تر لە سەدەی بیستەم لەلایەن هایزنبێرگ و ڕێبازی فیزیکی ئەتۆمی کۆپنهاگنی نیلسی بۆهەر هاتەبەر. هیوم لەو باوەڕەدا بووە چەندین ڕاستیی و ڕاستەقینەی ماتماتیکی و فاکتی ئەزموونەکی هەن. بە واتایەکی تر لێکۆڵینەوەی زانینی مرۆڤ ئەو ئەنجامەی لێ دەکەوێتەوە کە زانین وەك کەرەسەیەك بە ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە لە لایەك لەم دوو لایەنە بەوەلاوە نییە، شیکاریی یاخود لێکدراو[٥]. واتە زانین وەك بابەت و ناوەڕۆك لە ئەزموون و شارەزاییەوە سەرچاوە دەگرێ. بۆچوون لە هەستەکانەوە پەیدا دەبێ، زانین بەهۆی هەستەوە سەرچاوەی ڕاستیی هەموو زانینێکی شیکارییە. بەلای هیوم پەیوەندی نێوان هۆکارو ئەنجام هیچ بنچینەیەکی مەنتیقی نییە. نەریت و ڕاهاتن و دووبارەبوونەوە دەبنە مایەی ئەوەی مرۆڤ بڕوای بە بوونی پەیوەندی هەبێ لەنێوان دووشتدا کە یەکێکیان لەپێش ئەوی تریانەوە بێت.

کانت لە کتێبی چەند سەرەتایەکی هەر میتافیزێکیکی پاشەڕۆژ کە دەکرێ وەك زانست دەرکەوێ، دەڵێ:

بەئاشکرا دانی پیادادەنێم: دێڤید هیوم ئەوکەسە بوو، بەر لە چەند ساڵێك لە خەوی خەفڵەت بە خەبەری هێنام و لێکۆڵینەوەکانمی لە بواری فەلسەفەی تیۆریدا بەرەو ڕێگایەکی تر برد[٦].

کانت هەروەك خۆی لە هەمان کتێبدا وتویەتی، ئامادەنەبووە ئەو ئەنجامانە پەسند بکات کە لە بۆچوونەکانی هیوم کەوتونەتەوە، بەتایبەتی دانانی هەستەکان بەسەرچاوەی زانین و دڵ کرمێ بوون لە باوەڕی مەسیحی و قانونەکانی ئاکار کە



پشت بە سروش (وەحی) دەبەستن. کانت مەبەستی بوو بەجۆرێك میتافیزیك ڕەخنە بکات کە لاواز و لەقکردنی باوەڕبوون بە ئایین و بە بنەماکانی ئاکاری لێ نەکەوێتەوە. کانت لەو باوەڕەدا بووە کە زانین و ئایین، ژیر و بڕوا دوو مەیدان و بواری لەیەکتری جیاوازن. ڕاستە کانت، لەلایەکی ترەوە، ڕێبازی ڕوناکبیریی بەلاوە پەسندبووەو هەردوو ئامرازی ڕەخنەکردن و شیکردنەوەی لێ خواستۆتەوە، بەلاَم ئەو شیکردنەوەیەی کانت پیادەی کردوە شیکردنەوەی ترانسندنتالی بووە. واتە کانت بەو کارەی سەرگەرمی ئەوە بووە پێشیانە، پێش ئەوەی پەنا بەرێتەبەر هیچ تاقیکردنەوەیەکی تایبەتی، ئەو مەرجانە دەست نیشان بکات کە دەبنە مایەی کەوتنەوەو پەیدابوونی زانین، لە هەمان کاتدا سنور و سروشتەکەی دیاری دەکەن. جگە لەمە بابزانین بە چی تردا ئەم جۆرە شیکردنەوە ترانسندنتالییە لە هی بزوتنەوەی ڕوناکبیریی جیادەکرێتەوە؟

بزوتنەوەی ڕوناکبیریی ڕاستیی (هەقیقەت) لە تەبایی و هەماهەنگیی و بەیەکەوە گونجانی بیرومێشك لەگەڵ ڕاستەقینە (واقیع)دا دەبینێ، ئەو ڕاستەقینەیەی مێشك، ئەگەرچی بۆ مێشك خۆی شتێکی نامۆ و جیاواز و دەرەکییە، ڕەنگی وێنەکەی دەڕێژێ. واتە جیهانی بەرهەست و بۆچوون بەجیهانێکی ڕاستەقینە دەگۆڕێ، ئەو بنەما مەنتیقییانەی لە جیهانی بۆچووندا دەستبەکارو باون لە جیهانی دووەمدا پیادەو باو و دەستبەکار دەکات. کانت ئەم وێنەیەی ئاوەژوو کردۆتەوە، هەوڵی داوە ساغی بکاتەوە کە زانین لە سیستەمێکی ڕوخسارەکی کە بیرکردنەوەمان لەنێو هەستەکانماندا ڕەنگی دەڕێژێ بەولاوە نییە. ئەوەی ناوی (ڕاستیی) لێ نراوە چوارچێوەی سروشتێکی ناچارەکی و هەمەکییە و ناکرێ لەمە بەولاوە بێت کە بەپێی پێکهاتەی ناوەکی توانای زانینمان سیستەمێکی دیاریکراو بەسەر مێشك و بیرکردنەوەماندا دەیسەپێنێ. زانین پابەندی توانای پرۆسەی زانینمانە کە بەهۆیەوە دەوروبەر و واقیع بەو جۆرەی بۆمان دەردەکەوێ نەك خۆی





لەخۆیدا چۆنە دەزانین. بەم پێیە باڵەخانەی دۆگماتی بزوتنەوەی ڕۆشنگەری بەلای کانتەوە دادەتەپێ. کانت وتویەتی: تا ئێستا فەیلەسووفەکان وایان داناوە کە دەبێ زانینمان بەپێی بابەتەکانی دەوروبەر ڕێك بخرێت، با ئێمە بەپێچەوانەوە وای دابنێین، دوور نییە ئێمە لەوان سەرکەوتوتر و خۆشبەختتر بین، بابەتەکان دەبێ بەپێی ژیر و ئەقڵی ئێمە دابنرێن و ڕێك بخرێن[٧]. بەلای کانتەوە نابێ لەنێو ئەوشتانەی دەوروبەرماندا بەدوای لێکدانەوەیەکی قانونەکانی مێشکی مرۆڤدا بگەڕێین بەڵکو دەبێ لەمێشکدا ئەو شتە بدۆزێنەوە کە قانونەکانی (بوونی بابەتیی جیهانی) واقیعی پێ لێك دەدرێتەوە[٨].

کانت لە بیرو بۆچوون و فەلسەفەکەیدا، وەك لە بەرهەم و نووسراو وکتێبەکانیدا دەردەکەوێ بەدوو قۆناغدا تێپەڕیوە.

- قۆناغی یەکەم ئەو قۆناغەیە کە دەکەوێتە پێش قۆناغی دەرچوونی سێ کتێبە سەرەکییەکەی. (قۆناغی پێش ڕەخنە).

- قۆناغی دووەم تیایدا هەرسێك کتێبە ڕەخنەییەکە بلاوکرایەوە.

ڕەخنەکردنی ژیری بێگەرد ١٧٨١.

ڕەخنەکردنی ژیری پراکتیکی ١٧٨٨.

ڕەخنەکردنی توانای بڕیاردان ١٧٩٠.

ئەمە بە قۆناغی ڕەخنە ناسراوە، تیایدا ئەو چوارچێوەیە ڕەنگی ڕێژراوە کە تیایدا فەلسەفەی کانت بەیەکجارەکی خەت و خاڵی داوەو گەیشتۆتە لوتکەی پەرەسەندن و دوا شێوە و ڕوخسار و ناوەڕۆکی پێ براوە. ئەوی لێرەدا مەبەستمانە، بەتایبەتی قۆناغی ڕەخنە، ئەو پرسیارەیە کە بابەتێکی تێروتەسەل و بەپێزی لێ کەوتۆتەوە:



ئایا دەکرێ میتافیزیك هەبێ؟ کەوابوو کامانەن ئەو مەرج و هەل و پێداویستییانەی دەستەبەری بوون و ڕەوایی میتافیزیك دەکەن؟ دەکرێ میتافیزیك ببێ بە زانستێك لە زانستەکان؟

بۆ وەلاّمدانەوەی ئەم پرسیارە سێ لایەنییە، کانت لە دووبەرەدا خامەکەی خستۆتەکار.

- جیاکردنەوە و هەلاّوردنی زانینی هەستەکی لە زانینی ژیرەکی.

- دامەزراندنی میتافیزیك وەك سیستەمێکی ڕێکوپێك لەسەر بنچینەیەکی پتەوی زانستی.

بەیەکەوە گرێدانی هەردوو مەلۆیەکە، ئەگەرچی مەلۆی دووەمیان ئەگەر بەچاوێکی فەلسەفەیی تەماشا بکرێت لەجیاتی چارەسەرکردنی کێشەی میتافیزیك بابەتەکە پتر ئالۆزو تەم و مژاوی دەکات... ئەو کۆشکە دێتەبەرچاو کە کۆشکی فەلسەفەی ترانسندنتالی کانتی لێ پێك دێت. کانت وتویەتی: ئەقڵی مرۆڤ چارەنووسێکی سەیری هەیە، لە بەشێکی چالاکی زانینیدا چەند پرسیارێك باری سەرشانی قورس دەکەن ئەگەرچی ئەو پرسیارانە لە سروشتی خۆی دەکەونەوە بەلاّم ناتوانێ پشت گوێیان بخات و ناشتوانێ وەلاّمیان بداتەوە چونکە ئەم پرسیارانە لە سنوری توانا و وزەی ژیر بەدەرن[٩].

وەك لەم دەقە دەردەکەوێ خاوەنەکەی باسی سنورداریی هێزو توانای ژیر دەکات ئەمەش لەخۆیدا جۆرێکە لە گومان و گومان کردن لە کەڵك و سودی بەکارهێنانی ئەقڵ وەك ئامرازێك بۆ شت زانین و گەیشتنە ڕاستی لەخۆیدا بەبێ ئەوەی تواناکانی شی و توێ توێ بکرێت. بەلاّم کانت وەك لەدواییدا دەردەکەوێ ئەم گومانەی بۆ گەیشتنە دڵنیایی و دڵ ئاو خواردنەوە لە ئەنجامی توێژینەوەی فەلسەفەیی پشت ئەستور بە بنەماکانی ژیر بە هەنگاوێك داناوە.





ئەو رەخنەیەی كانت گرتویەتی، ئەو لایەنەی زانین دەگرێتەوە بگرە دەپێكی كە تیایدا ژیر بەبێ پشت بەستن و پەنابردنەبەر ئەزموون و شارەزایی سەرگەرمی زانینە. جابۆیە ئەم رەخنەیە لەخۆیدا دەری دەخات ئایا دەكرێ میتافیزیك هەبێ؟ ئەگەر ئا كەواتا سنورو سەرچاوەو رادەی بڕكردنەكەی چەند و كامانەن؟

هەروەك ئاشكرایە دێڤید هیوم، تارادەیەك لەكێشەی هۆیەكی و میتافیزیكدا، وەك كێشە نەك وەك ئەنجام، بەلای كانتەوە پەسندبووە، لەو باوەڕەدا بووە كە بۆچوونەكانی مێشكی مرۆڤ چەند بۆچوونێكن ئەقڵ لە وێنە هەستییەكان و تاقیكردنەوە و ئەزموونەوە دەستگیریان دەكات. بەلاَم كانت، ئەگەر چی دانی بە رۆڵی شارەزایی و ئەزموندا ناوە لە پرۆسەی زانیندا رۆڵی ژیری تیۆریی خستۆتە سەر ئەم پرۆسەیە و بەپێچەوانەی هیومەوە دووپاتی كردۆتەوە بۆچوون و بیرە ژیرییەكان چەند بۆچوونێكی ژیرەكین و سەرچاوەكەیان ژیر خۆیەتی. ئەو بەڵگەیەی ئەم قسەیەی پێ ساغ كردۆتەوە ئەوەیە كە ئەمانە پێشیانەن واتە بەر لە شارەزایی هەستەكی دەكەونەوەو پشت بە تاقیكردنەوە نابەستن و لێیەوە پەیدا نابن. ئیتر لێرەوە زانین دەكرێت بەدوو لایەن:

- ئەو كەرەسەیەی بەهۆی هەستەكانەوە دەستگیر دەبێ.

- بیر كە ئەو كەرەسەیە خۆش و رێكوپێك دەكات بەوەی دەیخاتە نێو چەند چوارچێوەیەكی مێشكییەوە كە كانت ناوی كاتیگۆری یاخود چەند چەمكێكی مێشكیی لێ ناون.

لە قۆناغی هەستدا شتە (بوونە) هەندەكییەكان لە كات و شوێنی دیاریكراودا هەست پێ دەكرێن، بەلاَم بیرۆكەی كات و شوێن، وەك كات و شوێن لە خۆیاندا بوونی سەربەخۆیان نییە بەڵكو بۆچوونێك یان چوارچێوەیەكی دەرك پێ بردنن، جا ناوەكی بێ یاخود دەرەكی. بیرومێشك هەستی ماددی، كەرەسەی هاوردەی



هەستەكان، دەكات بە زانینێكی پوختی خۆشكراو چونكە بیر لە پرۆسەیەكی دیاریكراوی تایبەتی چالاكی مێشك بەولاوە نییە.

زانین و وێنەی زانین بەشێوەیەكی جەوهەریی توندوتۆڵ بەیەكەوە بەستراون. هەموو زانینێك، بێ سێ و دوو لێ كردن، لە ئەزموون و تاقیكردنەوەوە سەرچاوە دەگرێ و دەست پێ دەكات. بەلاَم لەنێوان ئەوەی بەكردەكی لە زانین دەكەوێتەوە و ئەو وێنەیەی ئەم زانینە پێی دەبرێ و بە بەریدا دەكرێ جیاوازی هەیە. راستە زانین بە رێگای تاقیكردنەوە و ئەزموون پەیدا دەبێ، بەلاَم ئەم زانینە پێویستی بە مشتومالْ كردن و خۆشكردن هەیە ئەمەش وەك كەرەسەیەكی خاو پێویستی بە رۆڵی ئەقڵ و چەند چەمك و چوارچێوەیەكی ژیرەكی هەیە، بۆیە كانت وتویەتی: چەمكەكان بەبێ سەرنج دان پوچن و سەرنجدان بەبێ چەمكەكان كوێرە[١٠].

ژیر لە چالاكی تیۆری خۆیدا، واتە لە بواری زانیندا، بەشێوەیەكی پێشیانە ئەو مەرجە ناچاری و پێویستانە دەستنیشان دەكات كە تاقیكردنەوە بەبێیان ناكرێ و نابێ، ئینجا ئەو روخسار و شێوە و چوارچێوە بێگەردانە دابین دەكات كە دەبێ ناوەرۆكی ماددی تاقیكردنەوە، وەك كەرەسەیەكی خاوی بێ روخسار، تیایاندا رێكوپێك بكرێ و دابڕێژدرێ.

كانت، وەك پەسندكردنی بیرو بۆچوونەكانی هیوم، هەردوو مەلۆی زانین و میتافیزیك بەیەكەوە دەبەستێتەوەو لەو باوەڕەدابووە كە دەستنیشانكردنی پێشیانەی مەرجە ناچارییەكانی هەموو تاقیكردنەوەیەكی شیاوەكی هەنگاوێك دەچێتە ناو مەلۆی میتافیزیكەوە. هەربۆیە وای داناوە كە تاوتوێ كردنی بۆچوونی هۆیەكی (هۆكار و ئەنجام) كە هیوم دەستی پێ كردووە دەرگای كۆشكی میتافیزیكی خستۆتە سەر پشت، ئەگەرچی لە دوا هەنگاو و ئەنجامدا لەگەڵ هیوم نییە و بڕیارەكەشی پەسند نەكردووە.





راستە وەك هیوم بڕیاری داوە هۆیەکی مەسەلەیەکی شیکاریانە نییە[11]. واتە بار (پرێدیکات) بەهیچ جۆرێك لەنێو ناو (بکەر)دا نییە و لەو ناکەوێتەوە، بەڵکو دوو شتی جیان. بەلاّم لە ئەزموون و تاقیکردنەوە بەهیچ جۆرێك (ناچارەکی) ناکەوێتەوە و پەیدا نابێ، زانست خۆیشی بەندە بەم ناچارەکییەوە، بۆیە هەڵوێستەکەی هیوم کە وتویەتی، ناچارەکی لە دووبارەبوونەوە و شتی باوەوە دەکەوێتەوە، هەمان ئەنجامی لێ دەکەوێتەوە وەك بڵێی، میتافیزیك هەر نییە و ناکرێ پەیدا بکرێ[12]، چونکە ئەو بێ سێ و دوو وای داناوە کە ئەقڵ ناتوانێ هۆکار بەشێوەیەکی پێشیانە بزانێ و دەرکی پێ بەرێت.

بەلای کانتەوە بۆچوونەکەی هیوم لەجێگای خۆیدا نییە و چارەو شانسی میتافیزیك خۆی وایە کە کەس بەتەواوەتی لە پوختەکەی نەگەیشتووە[13]. بۆیە ئەو هەوڵ ئەدات بوونی میتافیزیك پشتڕاست بکاتەوە بۆ ئەم مەبەستە هێزوتوانای ژیری بێگەردو شارەزایی مرۆڤی توێ توێ کردوە و گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە میتافیزیك شتێکی پێویستە، ناچارەکی لەبەر دوو هۆ دەبێ هەر ببێ و هەبێ، یەکێکیان تیۆرییە و ئەوی تریان کردەکی. سەرنجدان و کردەوەی ژیانی ڕۆژانەو رەفتاری کردەکی بوونی میتافیزیك پشتڕاست دەکەنەوە. بۆیە کانت وتەنی (ئەو رەخنەیەی لە ژیری بێگەرد گرتم تەنیا پێشەکییەك بوو بەرەو میتافیزیك)[14].

**یەکەم:- هۆکاری تیۆری:**

توانا و هێزی شارەزایی مرۆڤ (خیبرە) تارادەیەك بڕ دەکات چونکە هەمەکی و سنوردارە. کەچی ژیری مرۆڤ (ئەقڵ) لەخۆیدا مەیلی ئەوەی هەیە لەو شتانە بکۆڵێتەوە کە لەو دیو ڕاستیی و ڕاستەقینەکانی شارەزایین و هەوڵ ئەدات لێکدانەوەیەکی هەمەکییانە دەربارەی ئەو شتانە بداتە دەست و پێشکەش بکات و ئینجا بەپێی توانا هەموو شتێك بزانێ. میتافیزیك لەخۆیدا لە لێکدانەوەی



هەمەکی شتەکان بەولاوە نییە. سەرەڕای ئەمە مرۆڤ لە سروشتەوە واخۆڵقاوە، لەو باوەڕەدایە دەتوانێ هەمیشە ئەو شتانە بزانێ کە بیریان لێ دەکاتەوە. ئەم جۆرە بڕوایەش بەردی بنچینەی میتافیزیکە.

لەلایەکی ترەوە شارەزایی مرۆڤ، لەبارێکەوە سروشتی تایبەتی و لەبارەکەی تریەوە سروشتێکی گشتی هەیە.

سروشتە تایبەتییەکەی شارەزایی بەهۆی تێبینیکردن و ئەزموون و تاقیکردنەوەوە دەردەکەوێ. سروشتە گشتییەکەی شارەزایی مرۆڤ ئەو بنچینەیەیە کە شارەزایی خۆی پشتی پێ دەبەستێ و هەر ئەو لایەنەیە وا لە شارەزایی دەکات ببێ بە شارەزایی. بەواتایەکی تر دەکرێ باسی مەرجەکانی پەیدابوون و کەوتنەوەی شارەزایی بکرێت بەلاّم لەتوانادا نییە لەم بوارەدا بەهۆی شارەزایی خۆیەوە وەك ئامرازێك ئەم مەرج و لایەنە بەگشتی سور و پشتڕاست بکرێتەوە. چونکە شارەزایی خۆی بەم لایەن و مەرجەوە بەندە. بۆ نموونە ئەو ڕستەیەی زەمان کە باسی مەرجەکانی شیاوەکی شارەزایی دەکات ناکرێ ڕاستی و ناڕاستییەکەی بەهۆی شارەزاییەوە پشتڕاست و ساغ بکرێتەوە. لێرەوە دەبێ میتافیزیك هەبێ.

**دووەم:- هۆکاری کردەکی:**

کانت لەو باوەڕەدا بووە شارەزایی (خیبرە — ئەزموون)و، ئاکارەکی و ژیانی چاکخوازیی و بەختەوەریی هەرسێکیان توندوتۆڵ بەیەکەوە بەستراونەتەوە و وەك ئەنجامێك لەبنەڕەتی ئەرك و فرمان و پەیوەست و لە پابەندبوون بە بنچینەی فرمانی ڕەهاوە کە کانت بە ئەڵمانی (Kategorische Imperativ)ی پێ دەڵێ، کەوتونەتەوە[15]. ئەمانە دەبنە مایەی بڕوابوون (ئیمان هێنان) بە بوونەوەرێکی بەرز کە خاوەن توانا و هێزی هەمەکی و لە رادەو سنور بەدەرە کە کانت بە (ڕەب) ناوی بردوە. هەروەها ئەو بڕوایەیان لێ دەکەوێتەوە کە ژیانی ئێستا، ژیانی ئەم





دنیایە ڕێ خۆشکەرە بۆ ژیانێکی تر کە لەدوای مردن دێت و هەروەها مرۆڤ خواستێکی سەربەست و ئازادی هەیە. ژیانی ئاکارەکی کەوابوو بەسێ بنەماوە بەندە کە بنچینەی میتافیزیکی کردەکییان لێ پێك دێت:

- بڕوابوون بەوەی ڕەب (خودا) هەیە.
- ئازادی خواست (ئیرادە).
- ژیانی نەمریی.

ئەم بنەمایانە لە سنوری دەسەلاَت و بڕکردنی شارەزایی مرۆڤ تێدەپەڕن و دەچنە دەرێ و ئەو مەرجانەیان لێ دەکەوێتەوە کە دەبنە بنچینەی هەموو ژیانێکی ڕێکوپێکی ئاکارەکی. میتافیزیك کۆرپەی بەناز و خۆشەویستی ژیر (ئەقڵ)ە و لەدایك بوونەکەی شتێکی ڕێککەوت نییە[١٦]. بەڵکو وەك هەموو شتێکی تری ئەم جیهانە لەپێناوی چەند مەبەست و ئامانجێکی گرنگ هاتۆتە دنیاوە، چونکە میتافیزیك بەپێی ئەو بنەماو خەسڵەت و سروشتە بنچینەییانەی هەیەتی لە سروشتی مرۆڤ خۆیەوە سەرچاوە دەگرێ. ژیر و ئەقڵ و فامی مرۆڤ بەهۆی ئەو پرسیارە میتافیزیکییانەی بێ پسانەوە هەمیشە ڕووبەڕووی دەبنەوە یەخەی بەرنادەن، بێ هیوا بوەو دەستی لەوە شتوە بتوانێ وەلاَمی پڕ بەپێست و چارەسەری ڕەوا و سەرتاپاگیریان بۆ بدۆزێتەوە. ئەو بیروبۆچوونە ترانسندنتی و لە ڕادەبەدەرانەی هەوڵی دۆزینەوەی ئەم چارەسەرە ئەدەن، لە خۆیاندا چەند کێشەو گرفتێکن کە ژیر و ئەقڵی مرۆڤ لەبەردەمیاندا دەستەوسان و بێ دەسەلاَت ڕادەمێنێ. بەلاَم سروشتی ژیان خۆی و هەلومەرجەکانی وا لەسەر مرۆڤ پێویست دەکەن، کانت وتەنی، بەردەوام بێ لە ژیانداو پێ پسانەوە هەوای پیس هەڵمژێت نەك لە هەناسەدان و هەوا هەڵمژینەکە خۆی ببوێرێ.



کەوابوو هەوای ناخاوێن هەڵمژین چاکترە لە هەناسە نەدان و بەردەوام نەبوونی ژیان کە لێرەدا مەبەست لە زانینی میتافیزیکیە. سروشت و خەسڵەتی ئەم زانینە میتافیزیکییە چییە و چۆنە؟ بەچی لەوی تر جیادەکرێتەوە، سنورەکانی کامانەن؟

زانینی میتافیزیکی بەپێی پێناسەی بۆچوونەکەی ناکرێ ئەزموونی بێت و ناکرێ بنەما و بنچینەکانی و سەرەتاکانیشی لە تاقیکردنەوەو ئەزموون و شارەزایی بکەونەوە، چونکە زانینی میتافیزیکی بەپێی سروشتی خۆی لە سنوری ئەزموون تێدەپەڕێ. تاقیکردنەوە لەدوو جۆر بەولاوە نییە.

یەکەم- تاقیکردنەوەی دەرەکی.

دووەم- تاقیکردنەوەی ناوەکی.

لە تاقیکردنەوەی دەرەکییەوە زانستی سروشت بەواتا تایبەتییەکەی پەیدا دەبێ. تاقیکردنەوەی دووەم کە ناوەکییە و لەناخەوە هەڵدەقوڵێ ئەو بنچینەیەیە کە سایکۆلۆجیی ئەزموونەکی لەسەر بنیات دەنرێ. هیچ کامێك لەم دوو تاقیکردنەوانە وەك بنەما بە کەڵکی میتافیزیك نایەن. چونکە زانستی میتافیزیك وەك میتافیزیك خۆی لە ژیری بێگەرد و ئەقڵی ڕووتەوە هەڵدەقوڵێ و پەیدا دەبێ. خۆ ئەگەر لە شارەزایی مرۆڤ وردبینەوەو بەوردی شی و توێ توێ بکەین و هەموو ئەو شتانەی لێ بکەینەوە کە سەر بە هەستەکانن، ئەوا چەند چەمکێکی بنەڕەتی هەر دەمێننەوە لەگەڵ چەند بڕیار(حوکم) ێك کە لەوان دەکەونەوە، چەند بڕیارێك کە دەبێ پێشیانە بن و سەر بە شارەزایی نەبن و پەیدابوونیان پەکی بە شارەزایی نەکەوتبێ. چونکە ئەم بڕیارانە[١٨] دەبنە مایەی ئەوەی مرۆڤ، دەربارەی ئەو شتانەی دەبن بە بابەتی هەستەکان، پتر لەوە بڵێ کە لە شارەزاییەوە فێر دەبێ، هەروەها چەند بڕیارێکیان تیادایە خەسڵەت و سروشتی گشتی و ناچارییان هەیە، ئەم دووانە ناکرێ لە زانینی ئەزموونییەوە بکەونەوە.





زانین لە خۆیدا، ئەگەر بشێ پێناسە بکرێت، پرۆسەیەکی ڕێکوپێکە خۆی لە چوارچێوەی بڕیار یاخود چەند بڕیارێکدا دەبینێتەوە کە دەربارەی چەند شتێك کە بابەتی بۆچوونی تایبەتیان لێ پێك دێت، دەدرێن. بڕیارەکان، لەلایەکی ترەوە، لە چەند مەسەلەیەك یاخود کێشەیەك کە ڕوخساری مەسەلەیان پێ براوە، بەوەلاوە نین، باسی ئەو تاقیکردنەوەیە دەکەن کە لە وێنەی زانیندا خەت و خاڵی داوە دوای ئەوەی ئەو چەمکانە (کە وەك چوارچێوەی گشتین)و چەند بنەمایەکی ژیرو ئەقڵن، دەخرێنە سەری. ئەگەر زانینی میتافیزیکی لە زانینی هەستەکان جیاواز بێ دەبێ بەم پێیە بڕیار و حوکمەکانیشی و بگرە کێشە و پرۆپۆزیشنەکانی لەو جیاواز بن. جا بابزانین جۆری بڕیار و حوکمەکان بەلای کانتەوە کامانەن. کانت لە مەنتیقدا شوێن پێی ئەریستۆی هەڵگرتووەو لەو باوەڕەدا بووە بڕیار لە ڕستە، پرۆپۆزیشن (مەسەلە) پێك دێت و مەسەلەکانیش لە چەندین وشە پێك هاتوون.

مەنتیقی ئەریستۆ مەنتیقی بابەت و بارە، لەسەر ئەم بنەمایە دەکرێ مەسەلەکان (کێشەکان) لەوەدا لە یەکتری جیابکرێنەوە کە بار لە بابەتەکەدایە یاخود لە بابەتەکەدا نییە. ئەگەر بڵێین، سوکرات مرۆڤە، لەدوو وشە پێك هاتووە، یەکەمیان بابەت(١٩) (بکەر، ناو) دووەمیان (خەبەر، مەحمول) بارە. ئەگەر ڕستەکە شیبکەینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە وشەی مرۆڤ وەك بار سیفەتێکە لە سوکراتدا خۆی هەیە و لێوەی جیانییە. بەڵام ئەگەر بوترێ ئاسن بە گەرمکردنی دەکشێ ئەوا بارەکە لەنێو بابەتەکەدا نییە چونکە ئاسن و کشان دوو شتی لە یەکتری جیاوازن.

بە واتایەکی تر لە هەموو ئەو بڕیارانەی دەدرێن، لە بۆچوونی مەنتیقەوە، پەیوەندی لەنێو بابەت و باردا هەیە، ئەو پەیوەندییە دەکرێ بەدوو جۆر بێ:

- بار سەر بە بابەتی (ب) دەبێ وەك شتێك لەنێو واتا گشتییەکەی (ب)دا. یان،



- بار لە دەرەوەی (ب)دا دەبێ ئەگەر چی بەشێوەیەك لە شێوەکان پێوەی بەستراوە. بەواتایەکی تر:

یەکەمیان بریتییە لە جۆرە ڕاڤە و لێکدانەوەیەك هیچ شتێك ناخاتە سەر خەرمانی ناوەڕۆکی زانین چونکە لەو شتە پتر ناڵێ کە لە بابەتەکەدا هەیە. بەڵام دووەمیان جۆرە فراوانکردنێکی تیادا دەبینرێ بەتایبەتی زانین پترو فراوانتر دەکات. یەکەمیان بڕیاری شیکارو دووەمیان بڕیاری لێکدراوە. جۆری یەکەم کە کێشەی شیکارییە پشت بە بنەمای بێ ناکۆکی دەبەستێ واتە ئەگەر ڕستەکە یاخود کێشەکەمان ناکرد خۆمان بەدرۆ دەخەینەوە، وەك ئەوەی بڵێی سوکرات مرۆڤ نییە.

بۆ نموونە ئەگەر سەرنجی ئەم ڕستەیە بدەین:(هەندێ لەش قورسن) ،کێشەیەکی لێکدراوە چونکە دەکرێ وای بۆبچین هەندێ لەش هەیە و قورس نین و قورسی بەشێکی جەوهەریی نییە لە بابەتی لەش.

بەلای کانتەوە ئەو زانینەی پابەندی بنچینەی تاقیکردنەوە نییە و پەکی پێ ی ناکەوێ زانینی پێشیانەیە واتە پێش تاقیکردنەوە دەستگیر دەبێ و بەند نییە بە تاقیکردنەوەوە. بەڵام ئەو زانینەی لە تاقیکردنەوەو ئەزموونەوە پەیدا دەبێ پێ ی دەوترێ زانینی پاشیانە، واتە ئەو زانینە لە پاش شارەزابوون و تاقیکردنەوەوە دێت و لەوان دەکەوێتەوە. لێرەدا شیکار کێشەی پێشیانەیە و لێکدراویش پاشیانەیە. بڕیاری شیکاریی خەسڵەت و سروشتی ناچارەکی و هەمەکی وەك پەیوەستێك لەنێوان بابەت و باردا دابین دەکات. بەڵام شیکردنەوەی بابەت بۆئەوەی بار لێوەی بەدەست بێ یاخود بکەوێتەوە نابێتە مایەی بەپێز بوون و پتر بوونی زانین. زانینی لێکدراویش سروشت و خەسڵەتی ناچاریی و هەمەکی تیادانییە.

لێرەوە ئەو کێشە ئاڵۆزە کەوتەوە کە تائێستا مایەی سەرقاڵی فەیلەسووف و خاوەن بیرو شارەزایانی ئەم کۆڕو مەیدانەیە. کانت پرسیویەتی: ئایا دەکرێ پرۆپۆزیشنی (بڕیار —





ڕستە)ی لێکدراو هەبێ کە زانینی نوێمان پێ دەبەخشێ و لە هەمانکاتدا پشت بە بنەمای ناچاریی و هەمەکی ببەستێ، واتە مەسەلە و کێشەی لێکدراوی پێشیانە(٢٠).

بەلای کانتەوە ئەم ڕستانە هەیە و بابەتەکانی میتافیزیك لەم جۆرەن واتە پرۆپۆزیشنەکانی میتافیزیك، بڕیار و بابەتەکانی لێکدراون، مەودای زانین فراوان و پتر دەکەن و پێشیانەن، نەپشت بە تاقیکردنەوە دەبەستن و نە بە تاقیکردنەوەو پێودانگی ئەزموونی پشتڕاست یاخود پووچەڵ دەکرێنەوە. میتافیزیك دەبێ بابەتەکانی لەم چەشنە بن بۆ ئەوەی زانستێکی بنچینە پتەو و سەخت بێت. ئەم بڕیارەی کانت دەربارەی بوونی ئەم جۆرە بڕیار و کێشە و پرۆپۆزیشنانە ئەو پریشکە بوو ئاگری لە دەشت و پاوانی فەلسەفەی پۆیتیڤیزم بە هەموو لایەنەکانیەوە بەردا. چۆن کانت توانیویەتی بوونی ئەم جۆرە بابەتانە ساغ بکاتەوە؟ گومان لەوەدا نییە، لە بۆچوونی مەنتیق و تیۆری زانینەوە پرۆپۆزیشنی لێکدراوی پاشیانە پشت بە تاقیکردنەوە دەبەستێ. ئەو ئەنجامانەش لە تاقیکردنەوەو ئەزموون دەکەونەوەو پەیدا دەبن هەندەکین و دەگۆڕێن، بەلاّم بابەت و بڕیاری میتافیزیکی ناکرێ لە تاقیکردنەوەوە بکەوێتەوە چونکە تاقیکردنەوە سروشتی ناچاریی و هەمەکی نییە. ئەگەر بمانەوێ پرۆپۆزیشن و بابەت و بڕیاری لێکدراوی پێشیانەمان دەستگیر ببێ، واتە ئەو بابەتانەی پشت بە ئەزموون دەبەستن و زانین و فراوان ئەکەن، بەلاّم بە شارەزایی و تاقیکردنەوەوە، وەك پێودانگ، نەپشتڕاست و نە پووچەڵ دەکرێنەوە، ئەوا دەبێ ئەم بابەتانە بەشێوەیەك لە شێوەکان بە (دەرك پێ بردن)ەوە، وەك پرۆسە، ببەسترێنەوە، بەو پێیەی دوو ڕەگەز، دوو لایەنیان تیادا بێ، لایەنێکی دەرك پێ بردن و لایەنێکی پێشیانەی پەك نەکەوتوو لەسەر تاقیکردنەوە. ئەم کارە ئەنجام دەدرێت ئەگەر هەلومەرجەکانی دەرك پێ بردن دابین کران. هەلومەرجی دەرك پێ بردن لە کات و جێگا بەولاوە نین. چونکە هەرشتێك بێتەکایەوە لەکات و جێگادا دێت، ئەوی دەرکی پێ دەبردرێ لە کات و جێگادا بەپێی چەندین



بنەمایەکی دیاریکراو دەبێ، ئەم بنەمایانە –لەبەر ئەم هۆیە- مەرجی پێویستی تاقیکردنەوەن واتە بەبێ ئەم مەرجانە تاقیکردنەوە پەیدا نابێ، ناکەوێتەوەو پیادە ناکرێ. کەوابوو ئەمانە پێشیانەن. وەك مەرجێك تاقیکردنەوە پشتیان پێ دەبەستێ بەلاّم خۆی ناتوانێ دروستی و نادروستیان ساغ و پشتڕاست بکاتەوە. سەلماندن و ساغکردنەوەی بوونی ئەم چەشنە کێشە و بابەتە ئەزموونییە پێشیانە بەندە بە مەرجەکانی تاقیکردنەوەوە، ئەگەر ئەم مەرجانە لە ئارادا نەبوونایە نەدەکرا بابەت و شت بزانرێن و دەرکیان پێ ببردرێ.

بۆ پتر پشتڕاستکردنەوەی بوونی بابەتی لێکدراوی پێشیانە کانت نموونەیەك لە بابەتی بیرکاریی (ژمێرە) دێنێتەوە. بابەتەکانی بیرکاری لێکدراوی پێشیانەن، ئەگەر پێنج و حەوت بەیەکەوە کۆبکەینەوە هاوکێشەیەکمان دەستگیر دەبێ:٥ + ٧= ١٢ ئەم هاوکێشەیە شیکاری پێشیانەیە، سادەو ساکارە، بەپێی بنەمای بێ ناکۆکی لە بۆچوونی کۆی پێنج و حەوت کەوتۆتەوە. بەلاّم ئەگەر بەوردی سەرنجی ئەم هاوکێشەیە بدەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە لە هەمان کاتدا لێکدراویشە چونکە چەمکی بۆچوونی ژمارە -١٢- لەنێو چەمکی بۆچوونی کۆی پێنج و حەوتدا نییە. بیرۆکەی یەکگرتنی (٥ و ٧) هیچ کاتێك واتای گشتی (١٢)ی لێ ناکەوێتەوە، بیرکردنەوە لە یەکگرتنی هەردوو ژمارە (٥ و ٧) نامان گەیەنێتە چەمکی مانای گشتی ژمارە (١٢)ی هاوکێشەکە، جا هەربۆیە دەبێ پەنابەرینە بەر ڕێگایەکی تر، ڕێگای سەرنجدان و وردبوونەوە، کە لەگەڵ ژمارەیەك لە ژمارەکان تەبا و گونجاو دەبێ، وەك پێنج پەنجەی دەستێك یاخود پێنج خاڵێك ئینجا یەك یەك بەژماردن پێنجەکە بخەینە سەر حەوت. ئیتر بەم پێیە بەهۆی هاوکێشەی ٧ + ٥ بۆچوونمان فراوانتر دەبێ و چەمکێکی تر دەکەوێتەوە کە ژمارە -١٢-یە. کەوابوو بابەت و پرۆپۆزیشنەکانی بیرکاریی (ماتماتیك) لێکدراوی پێشیانەن.





گومان لەوە ناكرێ، بەپێی ئەو سەرچاوانەی لەبەر دەستدان، كانت كارێكی گەورەی لە كۆڕ و كۆمەڵە ئەكادیمی و فەلسەفەی وڵاتانی ئەوروپا كردوە بەتایبەتی ئەوانەی زمانیان ئەڵمانی و فەرەنساییە. بەڵام وڵاتانی ئینگلیزی زمان تارادەیەك لەم كارتێكردنە قوتار و دووربوون. وەك ئاشكرایە رێبازی تاقیكردنەوەو ئەزموونی كە بە فرەنسیس بیكون دەستی پێكردوە و لەلای لۆرد رەسڵ كۆتایی هاتووە، فەلسەفەی باوی ئەم وڵاتانە بووە و تارادەیەك لە كانت و فەلسەفەكەی دوورە پەرێز بوون.

فەلسەفەی ئەزموونی مەنتیقی كۆڕی ڤیەننا، وەك لەناوەكەی دەردەكەوێ رێبازێكی پۆزیتیڤیستی پشت ئەستور بە ئەزموونە، ئەمەش هەر لە سەرەتاوە ئەو بۆچوونە ساغ دەكاتەوە كە ئەوكارەی فەلسەفەی كانت لەم رێبازەی كردوە، وەك رێبازێكی فەلسەفەی ترانسندنتیالی — ئایدیالیستی ئیتر چ وەك بابەت و ناوەرۆك چ وەك روخسار و میتۆدە كارێكی كەم و سەرنجڕانەكێش بووە. ئەگەر چی زۆربەی هەرە زۆری ئەم بیرمەندانە شارەزایی فەلسەفەی كانت بوون، بەڵام ئەم كار و كارتێكردنە دەكرێ وادابنرێ كە خۆی لە چوارچێوەی رەتكردنەوە و كاردانەوەیەكی نێگەتیڤ و نالەبار و پووچەڵكردنەوەدا نواندووە. وەك زانراوە كوڕی ڤیەننا پتر سەرگەرمی مەنتیق و تیۆری زانین و پووچەڵكردنی میتافیزیك بووە، كەوابوو كامانەن ئەو بنەما و بیرو بۆچوونانەی فەلسەفەی ئەم رێبازە، ئایا دەكرێ جۆرە خزمایەتیەكیان لەگەڵ هی كانتدا هەبووبێ یا خزمایەتیەكە شێوەی پایزی هەبووبێ؟ ئەگەر سەرنجێك لەو بابەتانە بدەین كە ئەندامانی كۆڕی ڤیەننا لە گۆڤارە ناوەندییەكەیاندا «زانین» بڵاویان كردۆتەوە بۆمان دەردەكەوێ كە كۆڕەكە پتر سەرگەرمی ئەم بابەتانە بووە بەگشتی:

یەكەم- پەرەپێدانی رێبازی ئەزموونی و سوود وەرگرتن لەو لێكۆڵینەوە و توێژینەوانەی دەربارەی مەنتیقی نوێ و مەنتیقی بیركاریی كراون بەتایبەتی ئەوانەی پیانۆ و فرێگە و لۆرد رەسڵ پەرەیان پێداون.



دووەم- توێ توێ كردنی بنچینە و بنەماكانی میتافیزیك و بیری میتافیزیكی بە مەبەستی پووچەڵ كردنەوەی و دوورخستنەوەی یەكجارەكی لە مەیدانی فەلسەفە و زانستدا.

سێیەم- داهێنانی ئامرازێكی كاریگەر بۆ بژاركردنی فەلسەفە و تێزە و گریمانەكانی زانست لە بیروبۆچوونی نازانستییانە. ئەم ئامرازە وەك پێودانگێكی كاریگەر لە چوارچێوەی شیكردنەوەی مەنتیقی زمان و زمانی زانستیدا خەت و خاڵیداوە و دەست بەكاربووە.

چوارەم- جارێكی تر چاوخشاندنەوە بە ئەركی سەرشانی فەلسەفە و بابەت و لقەكانیدا. فەلسەفە وەك جاران شای زانستەكان نەماوە، لەسەر تەختی شایەتی دانانیشێ، بەڵكو بووە بە بابەتێك خزمەتی سوود و قازانجی زانست و زاناكان دەكات، لە راپەڕاندنی ئەركی زانستی سەرشانیاندا بەرە و یەكگرتن و یەك رەنگی كردنی زانستەكان هاوكاری و كۆمەكیان پێ دەكات.

پێنجەم- رەتكردنەوەی بوونی بابەتی لێكدراوی پێشیانە، بەو جۆرەی كانت داكۆكی لێ كردووە. بابەتێك ئەگەر لێكدراو بوو ئەوا پاشیانە دەبێ، پشت بە شارەزایی و ئەزموون دەبەستێ، پێوانەی تایبەتی خۆی هەیە راستی و ناراستیەكەی پشت راست ئەكاتەوە، ئەگەر شیكاریش بوو ئەوا روخسار و فۆرم و جۆری پێكهاتەكەی دەستەبەری دروستی و نادروستییەكەی دەكەن، چونكە ئەم جۆرەی دوایی پتر ناوەرۆك هێمایین و هیچ شتێك دەربارەی دەوروبەر و جیهانی بابەتی ناڵێن.

میتافیزیك هەر لە سەرەتاوە لەو بابەتانە بووە كە كۆڕی ڤیەننا خستویەتیە بەر نەشتەری توێ توێ كردن، لە چەند بەرهەمێكی فەلسەفیی بەپیت و پێزدا بەتایبەتی رودۆلف كارناپ پشت ئەستور بەوەی كە ناكرێ و لەتوانادا نییە بەبێ پشت بەستن بە ئەزموون و شارەزایی و تاقیكردنەوە رەنگی كۆشك و باڵەخانەی





سیستەمێکی ژیرەکی ترانسندێنتی فەلسەفە برێژدرێ، هەولّی داوە کۆششی رابەرانی میتافیزیك بیّ بەر و مایە پووچ بکات.

دەست بەرداربوونی ئەزموون و تاقیکردنەوە پشتکردنە بنەماکانی فەلسەفە و زانستە بەگشتی. شیکردنەوەی مەنتیقی زمانی بابەتەکانی میتافیزیك بەگشتی و ئەو پەیڕەوانەی لەو سیستەمە فەلسەفییە جۆربەجۆرانەدا پشتیان پیّ بەستراوە بەجۆرێك یەك لا و ساغی دەکاتەوە کە ئەم سیستەمانە لەسەر بنچینەیەك دانراون و رەنگیان رێژاوە کە بەراستی و دروستیی بەکارهێنانی زمان و سێنتاکسی زمانیان پەیڕەو نەکردووە. رودۆلف کارناپ لە سیّ بەرهەمیدا کە لەکاتی دەستبەکاربوونی لە ڤیەننا بلاّوی کردونەتەوە لەژێر ناوی:

**یەکەم:** کێشە ناراستەکان لە فەلسەفەدا — ١٩٢٨.

**دووەم:** پووچەڵکردنەوەی میتافیزیك بەهۆی شیکردنەوەی مەنتیقیی زمان ١٩٣٢.

**سێیەم:** بنیاتنانی مەنتیقییانەی جیهان ١٩٢٨.

بۆ پووچەڵکردنەوەی سیستەمی سەرتاپاگیری میتافیزیکی و ئەو هەوڵەی بۆ بنیاتنانی کۆشك و باڵەخانەی میتافیزیك لەسەر بناغەی بەناو جۆرە زانست و زانستییانە دەدریّ هەولێکی سەرنج راکێشی داوە. جگە لەوەی کۆششی کردوە کە تیۆری کلاسیکی زانین بەشێوە باوەکەی هەڵوەشێنێتەوەو بەردی بناغەی تیۆرێکی نوێی زانین دابنیّ کە لەگەڵ سەردەم و کەش و هەواو هەلومەرجەکانی پەرەسەندنی زانستدا تەباو گونجاو بێت. بەلای کارناپەوە، لە ئەنجامی بەکارهێنانی ئامرازی شیکردنەوەی مەنتیقیی زمان ساغ دەبێتەوە کە ڕستە و پرۆپۆزیشن و بابەتەکانی میتافیزیك لەسەر بنەمایەکی ناکۆك و ناتەبا دامەزراون. هەر لەم روانگەیەوە کارناپ جەوهەر و پوختەی فەلسەفەی دەستنیشان کردووە لەوەدا کە بریتییە لە شیکردنەوەی مەنتیقیی و دەریخستوە کە فەلسەفە مەنتیقی زانستەکانە. زانست



سەرگەرمی ناوەڕۆکی زانینە و فەلسەفە شیکردنەوەی پێکهاتە و دامەزرانی مەنتیقی زمان بە بەشێك لە زانین دادەنیّ و بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانیّ. بۆ ساغکردنەوەی بۆچوونەکانی، کارناپ چەند نموونەیەکی گرنگی هێناوەتەوە، یەکە یەکە شی و تویّ تویّی کردوونەوە... نموونەیەك لەو نموونانە دەقێکە لە نووسراوێکی مارتن هایدیگەر وەریگرتووە و دوای شیکردنەوە و لێکدانەوەیەکی ورد و قووڵ دەگاتە ئەو ئەنجامەی گوایە گریّ کوێرەکەی کردۆتەوە[٢٤]. لە شیکردنەوەی ئەم تێکستەوە (کە لە پەراوێزدا کراوە بە کوردی) دەردەکەویّ کە کۆیەك وشە بەکارهاتوون شێوەیان لە ڕستە و پرۆپۆزیشن و بابەت دەچیّ بەلاّم ئەوی راست بیّ لە چەند ڕستەیەکی زڕ و ساختە و نادروست بەولاوە نین، جگە لەوەی پووچ و بیّ مانان. بۆ نموونە هایدیگەر وشەی «هیچ» وەك ناوی بابەتێك بەکاردێنیّ ئەمەش نیشانەی نەشارەزاییە لە مەنتیق و سێنتاکسی زمان. ئەم نیمچە رستانە لە کۆمەڵە وشەیەکی لە تەنیشت یەکتری ریزکراو داڕێژراون کە بە پێچەوانەی بنەماکانی مەنتیقن و نووسەرەکە لە بنەماکانی مەنتیقی زمان نەشارەزایە و ئەو پرسیارانەش کە کردوونی پرسیاری بیّ مانان بۆیە وەلاّمی بیّ مانایان لیّ دەکەوێتەوە. بۆ کردنەوەی ئەم گریّ کوێرە و ئینجا پووچەڵکردنی میتافیزیك کارناپ پەنا دەباتە بەر ئەو پێودانگەی کە بە پێوانەی مانای ئەزموونی ناوی دەبات. کاتێك ڕستەیەك پڕ واتا دەبیّ ئەگەر ئەم مەرجانەی تیادا بوو یاخود لە داڕشتنیدا ئەم مەرجانە ڕەچاوکران:

**یەکەم:** پێویستە بەوردی روخساری ڕستە سەرەکییەکە کە مانای وشەیەك لە وشەکانی تیادا هاتووە دیاری بکرێت. بۆ نموونە کە دەڵێین: پێشمەرگە، ئەوا دەبیّ روخسار و وێنەی ڕستەکە لە بۆچوونی مەنتیقی نوێوە بەم شێوەیە بیّ: (س) پێشمەرگەیە.





**دووەم:** ئایا ئەم ڕستەیە لە چ ڕستەیەکی سەرەکییەوە کەوتۆتەوە؟ ئەگەر ئەم دوو مەرجە بەوردی و بەپێی بنەما وردەکانی مەنتیق پەیڕەو بکرێن دەکرێ ئەم جۆرە هەلاّنە پەردەیان لەسەر لابدرێ و کێشە تەمومژاویەکە روون و ئاشکرا ببێ. ڕستە بێ ماناکانی میتافیزیك بەدوو شێوە پەیدا دەبن:-

یەك:- کاتێك چەند چەمکێکی بێ مانا بەکار دەهێنرێن، ئیتر ئەو ڕستەیەی ئەم چەمکانەی تێدا دەبێ بێ مانا و پووچ دەبێ.

دوو:- یاخود لە ڕستە بەکارهێنراوەکاندا بەدروستی بنەماکانی مەنتیقیی سێنتاکس پەیڕەو ناکرێن. شیکردنەوەی مەنتیقی بنەماکانی زمان ئەم لایەنانە بەدەردەخات. بەواتایەکی تر شیکردنەوەی بنەما مەنتیقییەکانی زمانی بەکارهاتوو لە بابەتی میتافیزیکدا بە پشتیوانی پێودانگی ئەزموونی واتا هەمموو ئەو چەمك و ڕستانە بەدیاردەخات کە مەرجی ئیمپرییان تیادا نییە و بێ مانان و لەجێگای خۆیاندا بەدروستیی بەکارنەهاتوون. لەلایەکی ترەوە ئەگەر ئەو پێودانگە بەکاربهێنرێ کە لە زانستە ئەزموونییەکاندا پەیڕەو دەکرێ ئەوا ڕستە ناوبراوەکان وەك ڕستەی هەڵە و چەواشە ئاشکرا دەبن. کارناپ دەڵێ: زمان لە وشە و سێنتاکس پێك دێت واتە لە چەند وشەیەك کە مانایان هەبێ و بەپێی بنەمای ڕێزمان بەیەکەوە داڕێژرابن، ئەو بنەمایانەی ڕێزمان دەریان دەخات چۆن لە وشەی جۆراوجۆر و جیاواز ڕستە پێك دێت و ڕۆ دەنرێت. هەر بەم پێودانگە دوو جۆرە زڕە ڕستە هەیە[٢٥]:

یەکەم:- لە ڕستەکەدا وشەیەك بەکار دێت، مرۆڤ بە هەڵە وادەزانی کە وشەکە مانای هەیە یاخود:



دووەم- ئەو وشانەی لە ڕستەکەدان مانایان هەیە بەلاّم بەشێوەیەك بەکارهاتوون بەپێچەوانەی بنەمای سێنتاکسی زمانەوەیە، بۆیە ماناکانیان تەمومژاوی دەبن. ئەم دوو جۆرە رستانە لە میتافیزیکدا بەکاردێن.

ڕستە ئامرازێکە بۆ دەربڕینی هەست و نەست و خواست و مەبەست، هەروەها زانین، خۆی پەنا دەباتە بەر ڕستە بۆ بەرجەستەکردنی ناوەڕۆکەکەی. کەوابوو، دوای باسکردنی ڕستە و جۆرەکانی ئایا زانین خۆی چۆن و لەچی دەکەوێتەوە و سەرچاوەکانی کامانەن. بەپێی بۆچوونی رابەرانی کۆڕی ڤیەننا دوو جۆرە سەرچاوە هەیە زانینیان لێ دەکەوێتەوە:

یەکەم- تاقیکردنەوەو شارەزایی و ئەزموون سەرچاوەیەکی سەرەکی هەموو ئەو شتانەن کە مرۆڤ دەربارەی دەوروبەر دەیانزانێ.

دووەم- چالاکی ژیرەکی و ئەقڵ ئەمەش سروشتێکی روخسارەکی و چوارچێوەیی هەیە و ناکرێ ببێ بە سەرچاوەی بابەتەکانی زانین. ئەوی ژیر لەم بوارەدا دەیکات ئەمانەیە:

وەك ئامرازێك جۆرە توانایەك بۆ مرۆڤ دابین دەکات کە بتوانێ بەهۆیەوە ئەنجامی روخسارەکی لە پرۆپۆزیشن و ڕستە سەرەتاییە سەرەکیەکانەوە بەدەست بهێنێ و بەراوردێکی روخسارەکی لەنێوانیاندا بکات بۆ ئەوەی جۆرە سروشتێکی تەبایی و ڕێکوپێکی و کۆکییان پێ ببەخشێ. ئەم بۆچوونە پتر بیروبۆچوونەکانی کانت دەهێنێتەوە یاد کە وتویەتی ئەو کەرەسە خاوەی بەهۆی هەستەکانەوە دەربارەی دەوروبەر دەستگیرمان دەبێ، مێشك (فام، ژیر) ڕێکوپێکی دەکات و لە چەند چوارچێوەیەکی گشتیدا دایدەڕێژێ، ئەم چوارچێوانە جۆرە ڕێکوپێکی و تەباییەك بە کەرەسە زانراوەکە دەبەخشن وەك چەمکی کات و شوێن و... هتد. ئیتر لێرەوە جۆرە ئاشنایەتیەکی گیانی لە نێوان کانت و رابەرانی کۆڕی ڤیەننا دەردەکەوێ.





مەنتیق و تیۆری زانین کە بابەتی سەرەکی فەلسەفەن، ئەو ئامراز و کەرەسانە دابین دەکەن کە بابەتی میتافیزیکیان پێ شەن و کەو دەکرێ. ئیتر بۆیە پشت ئەستور بە سەرچاوەکانی زانین و رۆڵی مەنتیق لە فەلسەفەدا، کارناپ لەو باوەڕەدابووە کە کێشە و پرۆپۆزیشنەکان بەگشتی لەسێ جۆر بەدەرنین:

یەکەم:- کێشە و ڕستەکانی زانستی بیرکاریی و مەنتیق.

دووەم:- کێشەکانی زانستە ریالیستییە ئەزموونییەکان.

سێیەم:- ئەو کێشانەی پووچ و بێ واتان.

کێشەکانی زانستی بیرکاریی و مەنتیق شیکارین راستی و نا راستییان بەندە بە پێکهاتەی ناوەکی و هارمۆنی و تەبایی مەنتیقی دارشتنیانەوە. ئەم جۆرە رستانە (کێشانە) هیچ دەربارەی دەوروبەر نالێن و ئەوی لە بابەتەکەدا هەیە لە بارەکەدا دووبارە دەبێتەوە، بۆیە بەدوو خەسڵەت ناسراون: ناچارەکی و پێشیانە. ئەم دوو سروشتە ناکرێ لە شارەزایی و تاقیکردنەوەوە بکەونەوە. ناچاریی و راستییەکەیان لەوەدایە ئەگەر نا بکرێن جۆرە سەرپێچی و پێچەوانەییەکی بنەماکانی مەنتیق و زمان دێتە ئاراوەو مرۆڤ خۆی بەرپەرچی قسەی خۆی ئەداتەوە. ئەم جۆرە رستانە ناوەڕۆکێکی مادی و واقیعییان نییە. ئەو ئەرکەی لە پرۆسەی زانیندا دەکەوێتە ئەستۆیان بریتییە لە رێکوپێککردنی شارەزایی و چارەسەرکردن و بەلایەکدا خستنی ئەو ناکۆکی و دژایەتییەی دوور نییە لە کێشەکانی تردا پەیدا بن وەك کێشەکانی فیزیك... هتد.

ڕستە و کێشەکانی فیزیك لێکدراون واتە ناوەڕۆکەکانیان بریتین لە دیاردەکانی جیهانی دەوروبەر و دەبنە مایەی بەپێزکردن و فراوانکردنی زانینی مرۆڤ. راستی و ناراستیان بەوەوە بەندە، ئایا بەراستی و تەواوەتی کە دڵنیایی لێ بکرێت ئەو دەوروبەرە کە لێیەوە کەوتوونەتەوە دەردەبڕن؟ تێبینیکردن وەك پێوانەیەك راستیی یاخود ناراستیی ئەم جۆرە



رستانە ساغ دەکاتەوە و دەری دەخات ئایا ئەو شتەی لەم رستانەدا هاتووە و دەردەبڕدرێ بەراستیی وەك دەربڕینەکەیە و ئایا هەیە یان نییە؟

جۆری سێیەمی ئەم ڕستە (کێشانە) کە دەکرێ بەزرە ڕستە و نیمچە کێشە ناوبرێن ڕستە و کێشە و بابەتەکانی میتافیزیکن و هیچ جۆرە واتا و مانایەکی راستەقینە (واقیعی)ی ئەزموونیان تیادا نییە، دەکرێ ئەم جۆرە رستانە بە ڕستەی گشتی دابنرێن کە ناکرێ راستییەکەیان بە بنەما گشتییەکانی بەکارهێنانی زمان و تێبینی راستەوخۆ ساغ بکرێتەوە. خۆ ئەگەر لەتوانادا بێ راستییەکەیان بەرێگای یەکەم ساغ بکرێتەوە ئەوا ڕستە میتافیزیکییەکان دەبن بە چەند ڕستەیەکی شیکاری و ئەم جۆرە رستانە تەنیا روخسارن و هیچ ناوەڕۆکێکی راستەقینەیان نییە و باسی دەوروبەر ناکەن و هیچ جۆرە زانینێك ناخەنە سەر خەرمانی ئەو شتانەی زانراون و راستیەکەیان دەبێتە شتێکی روخسارەکی. بێگومان رابەری میتافیزیکی ئەمە پەسند ناکات و قایل نابێ کێشە و ڕستەکانی بابەتەکەی بەم جۆرە بن. بۆیە دەبێ پەنا ببردرێتە بەر پێوانەی تر وەك تاقیکردنەوە و ئەزموون و تێبینی بۆ ساغکردنەوەی (واقیعیەتی) ناوەڕۆکی ئەم جۆرە بابەتانە. لێرەدا ڕستەی میتافیزیکی، ئەگەر پشت بەم پێوانەیە ببەستێ، سروشتی ناچاریی و هەمەکیی لە دەست دەدات و بەو جۆرە نابێ کە رابەرانی میتافیزیك دەیانەوێ. کەوابوو لەرێگایەك بەولاوە لەبەردەمدا نییە، دوورخستنەوەی ڕستە و بابەتەکانی میتافیزیك لە گۆڕەپانی لێکۆڵینەوەی زانستی و فەلسەفەدا، چونکە ئەوان لە درێژدادڕیی و کێشەی تەمومژاوی و قسەی بێ مانا بەولاوە نین. کارناپ دەڵێ:

میتافیزیك دەربڕینێکی نەگونجاو و نابەجێی هەستی ژیانە، دانەری سیستەمی میتافیزیکی کەسێکە لە مۆسیقاژەنێکی بێ بەهرەی هونەری مۆسیقا دەچێ، یاخود شاعیرێکە بێ تواناو بێ سەلیقە و بێ بەهرەی شاعیرێتییە[٢٦].

ئەگەر بێتو ئەو بۆچوونەی کارناپ دەربارەی میتافیزیك پەسند بێ، چۆن هەوڵ و کۆششی فەیلەسوفی گەورە و بەناوبانگی وەك ئەریستۆ و تۆمای ئەکوینی و دیکارت و هیگڵ و.... هتد، لێکدەدرێتەوە کە ئەو سیستەم و تەلارە رازاوەیەی (فەلسەفە بەگشتی و میتافیزیك بەتایبەتی)یان داناوە؟ ئایا ئەم کەڵە فەیلەسوفانە شاعیری بێ بەهرە بوون و شارەزاییان لە مەنتیقی زمان نەبووە؟ تۆ بڵێی ڕستە و کێشە و بابەتەکانی فەلسەفە سەرتاپاگیرەکەی هیگڵ چەند زرە ڕستەی بێ مانابن؟ ئەو مێشکەی ئەم بلیمەتانە تەنیا قسەی بێ مانا و ڕستەی بێ ناوك و پووچیان بە خامەکانیان تۆمار کردووە؟

فەلسەفە و میتافیزیك و زانست ئەگەر لە خۆیاندا کێشەیەکی سەختی ژیان نەبن، ئیتر ژیانی بیر و تیۆری بێت یاخود هی کردەکی، هەر لە بیرکردنەوە و سەرنجدان و ئینجا لێکۆڵینەوەوە تا دەگاتە گوزەران و کاروباری ژیانی رۆژانە، بێ سێ و دوو لێ کردن، چ وەك دیاردە و چ وەك هۆکار توندوتۆڵ بەژیانەوە بەستراونەتەوە. کێشەی میتافیزیك و کێشەی فەلسەفە و زانست هەرگیز ناکرێ چەندین ڕستە و بابەت و کێشە و پرۆپۆزیشنێکی فۆڕمووله کراوبن، پێویستە لێیان پێچرێتەوە، توێ توێ بکرێن کامیان راستە و کامیان سەرکێشییان لە بنەماکانی سێنتاکس و وشە ڕۆنان و ڕستە داڕشتن کردووە. ئەم کارە دەکرێ بە بەشێك لە مەنتیقی نوێ دابنرێ، بەڵام کێشەی میتافیزیك خۆی کە بەشێکە لە ژیان بەهیچ جۆرێك بەلایەکدا ناخات. ژیان بەبێ کێشە شتێکە تەنیا لە بیر و مێشکی نووسەران و شاعیراندا هەیە. ژیان بۆ خۆی گرێ کوێرە و کێشەیەکی سەرسوورهێنەرە. تاوەکو ژیان بمێنی، کێشە و بەرە هەردەمێنێ، میتافیزیکیش بوونی خۆی لە دەست نادات بەڵام بەشێوە و ناوەرۆکێك لەگەڵ پەرەسەندنی ژیان و زانست و کۆمەڵدا بگونجێ، دێتە پێشەوە و برەو بە بوون و دەستبەرکارییەکەی دەدات. کارناپ لەو باوەڕەدابووە، زانست و ئایین و هونەر سێ جۆی سەرەکی چالاکی بیریی و مێشکی مرۆڤن. میتافیزیکیش لە تێکەڵ و پێکەڵکردنێکی



شێواو و تەمومژاوی ئەم سێ جۆرەی چالاکی مرۆڤ بەولاوە نییە[٢٧]. مرۆڤی میتافیزیکی کەسێکە پێویستی بەوە هەیە هەست و نەستی خۆی بەرامبەر بە ژیان دەربڕێ، بەڵام لە توانایدا نییە ئامراز و ڕێگایەکی شیاوی پڕ بە پێستی ئەم ئەرکە دابهێنی و بدۆزێتەوە، بۆیە ناچارە پەنا دەباتە بەر گەمە و بازیکردن بە وشە و ڕستەی نائاسایی، واش دەزانێ ئەم ڕستە و وشانە هی زمانی زانستن و هەست و نەستی ناوخۆی خۆی دەربارەی جیهان پێیان دەردەبڕێ.

ئەو هەڵوێستەی کارناپ دوورکەوتنەوەیەکی روون و ئاشکرایە نەك هەر لە بیر و بۆچوونەکانی کانت و فەلسەفەی ئایدیالیستی، بەڵکو چوونە ریزی پۆزیتیڤیزمی نوێیە، ئەو پۆزیتیڤیزمەی لە کۆنت کەوتەوە و ئینجا ئیمپریزمی هیوم تا ئەگاتە ئێرنست ماخ، بەتایبەتی ئەگەر هەڵوێستی لەمەوبەر باسکراوەکەی جارێکی تر بهێنینەوە بەرچاو بەتایبەتی لەوەدا کە ڕستە و هاوکێشەکانی بیرکاریی، بەپێچەوانەی کانت، بە چەند ڕستەیەکی شیکاریی نالێکدراو دادەنێ. هەروەها بەکارهێنانی بیرکاری وەك (میتودە، پەیڕەو، ئامراز) لە بواری فیزیکدا بەگشتی و لە ئەندازەی فیزیکیدا بەتایبەتی دەکرێ بەهۆی ئەو تاقیکردنەوە جیاجیایانەی دەکرێن، کەلەبەرەکانی پڕ بکرێنەوە و ناڕاستی و کەموکوڕییەکانی بەلایەکدا بخرێن، بۆیە زانینی لێکدراوی شیکاریی لە ئارادا نییە.

ئەگەر تێزەی پووچ و بێ مانایی ڕستەکانی میتافیزیك لەگەڵ ئەوەدا کە ڕستەکانی بیرکاریی شیکارین بەیەکەوە گرێ بدەین و هەوڵ و کۆششی گۆتلۆب فرێگە و لۆرد رەسڵ دەربارەی گێڕانەوەی بابەتی بیرکاریی بۆ سەر چەند بنەمایەکی مەنتیقی لەبەرچاو بگیرێن ئەوا بە تەواوەتی بنچینەی بۆچوونی کانت دەربارەی زانینی پێشیانەی لێکدراو، هەڵئەتەکێنرێ. کانت پشت ئەستور بە ئەندازەی ئۆیکلیدس و زانستە جۆربەجۆرەکانی سەردەمی خۆی لەو باوەڕەدابوو ژمێرە سروشتێکی پێشیانەی لێکدراوی هەیە. رەسڵ لە چەند بەرهەمێکیدا ساغیکردەوە کە زانستی ژمێرە دەکرێ لە مەنتیق بکەوێتەوە و





ناچاریی بیرکاریی سروشتێکی شیکاریی هەیە و هیچ جۆرە لایەنێکی لێکدراوی پێشیانە لە بابەتی ماتماتیکدا نییە.

فەلسەفەی رەخنەگریی کانت، کە لە کۆڕ و کۆمەڵە زانستی و فەلسەفییەکاندا بە ئایدیالیزمی ترانسندنتالی ناودەبرێ، کۆرپەی سەدەی هەژدەهەم و ئەو دەوروبەرەیە کە تیایدا گۆش بووە. گومان لەوەدا نییە کە فیزیکی نیوتن بەتایبەتی ئەو لایەنەی بوونی بیر و تێزەی کات و جێگای رەها (موتڵەق) و رەهای ناچارەکی قانونەکانی سروشت پشتڕاست دەکاتەوە ئەو بنەما و بنچینەیە بووە کە کانت کۆشکەکەی لەسەر دامەزراندووە. سەرەڕای مەیلی جەرمانی کانت کە هەمیشە لە بواری بیر و ئایدیۆلۆجی و فەلسەفەدا سەرگەرمی داڕشتنی بنچینەی سیستەمی سەرتاپاگیر و کۆشك و تەلار ئاسای بڵند و سەرکەشە و بەنموونەییترین و باشترین شت نەبێ قایل نابێ.

بەلای کانتەوە رێبازەکەی نیوتن، ئەگەر وەك فەلسەفە سەرنج بدرێ، دوا قۆناغی پەرەسەندنی زانینی زانستی سروشتە، بۆیە هەوڵی داوە ئەو بیروبۆچوونە فیزیکییانە بەرەو رێبازێکی سەرتاپاگیری فەلسەفەیی پەرەپێبدات. ئەو بە تەواوەتی لەو باوەڕەدا بووە ئەگەر بتوانێ بنەماکانی سیستەمەکەی نیوتن لە سەرچاوەی ژیری بێ گەردەوە دەستگیر بکات ئەوا دەگاتە ئەو مەبەستەی وەك گرێ بووە لە دڵیدا: پاکانەکردنی ژیرەکی تەواو بۆ زانین. هەروەها بڕوای بە دروستی ئەندازەی ئویکلیدس هەبووە کە ئەو کاتە باوبووە. بۆیە دەکرێ بوترێ، لەگەڵ گۆڕانی شێوە و ناوەڕۆکی فیزیکی نوێ و هەرەسهێنانی چمك و بیرۆکەو تێزەکانی فیزیکی نیوتن و پەیدابوونی ئەندازەتری وەك (ریمان، لۆباچیڤسکی، بۆلیای...) ئەو بناغەیە هەڵتەکێنرا کە کانت تەلاری فەلسەفەکەی لەسەر داڕشتبوو.

سروشتی سەرەکی فەلسەفەی ئەم سەردەمە (جگە لە فەلسەفەی ئیگزستیانتیالیزم — کیرکێگارد، هایدیگەر، سارتر...) سروشتێکی ئەزموونییە و سوود لە تاقیکردنەوە



سەرکەوتووەکانی زانست وەردەگرێ. بۆیە دەکرێ بڵێین ئەو کارەی کانت لە فەلسەفەی ئەزموونی مەنتیقی کردوویەتی زۆر کەم و هەندەکی بووە. تەنانەت لە مانیفێستی زانستیی کۆڕەکەدا (تێگەیشتنی زانستیانەی جیهان — بە ئەڵمانی — ل١٢) بەشێوەیەکی لابەلایی و لاوەکی ناوی کانت وەك سەرچاوە هێنراوە. بۆ نموونە ناوی فەیلەسوفەکانی رێبازی پۆزیتیڤیزم و ئیمپریزم و زانستییە ئەزموونی و مەنتیق و زاناکان بە رێکوپێکی هێنراوە کەچی بەشێوەیەکی لابەلایی نەبێ باسی کانت و کانتیانیزمی نوێ نەکراوە. لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێ رۆڵی کانت و رابەرانی کانتیانیزمی نوێ لەم بوارەدا پشتگوێ بخرێ. تەنانەت باسی دکتۆرای کارناپ (دەربارەی جێگای فیزیکی لە بۆچوونی فەلسەفییەوە) تاڕادەیەك پشت راستکردنەوەی هەندێ بیروبۆچوونی کانتە. لێرەدا پشت ئەستور بەکانت و رابەرانی رێبازی نوێ کانت، بەتایبەتی پاول ناتۆرپ و ئێرنست کاسیرەر جێگا دەکات بە سێ جۆرەوە: جێگای روخسارەکی، جێگای تیۆریی و جێگای فیزیکی[٢٨]. شان بەشانی ئەم بۆچوونە رۆڵی ئەندازەی نائویکلیدی و تیۆری رێژەیی ئاینشتاین هەست پێ دەکرێت.

فەلسەفەی تیۆری کانت بەگشتی دەکرێ ببێ بەدوو بەشەوە:

یەکەم- لایەنێکی لەباری دامەزراندن و بنیات نان.

دووەم- لایەنێکی نالەبار واتە هەڵوەشاندنەوەی بۆچوونەکانی پێش خۆی لایەنی یەکەمی تیۆری زانستی و بنەرەت دانانی فەلسەفەی ترانسندنتالی ئایدیالیزم دەگرێتە خۆی. تیۆری زانستی بریتیە لە فەلسەفەی شوێن و کات سەرەڕای تیۆری شارەزایی (خیبرە).

لایەنی دووەمی کە بەلایەنی هەڵوەشاندنەوە دادەنرێ — ئەگەر بشێ ئەم ناوە بەکاربهێنرێ- بریتیە لەو لێکۆڵینەوەیەی کانت بۆ هەڵوەشاندنەوەی بنچینە و پایەکانی میتافیزیکی کلاسیکی کردوویەتی. ئینجا هەوڵدان بۆ بەزانستیکردنی میتافیزیك دێتەسەری.





کانت لە پرۆسەی ڕەخنەکردنی توانای ژیری بێگەردا ویستویەتی چەندین بنەمای سەرەکی دەستگیر بکات بۆ ئەوەی وەك بنچینەیەکی پتەو و گومان لێ نەکراوی زانستییانە میتافیزیکی لەسەر بنیات بنێ. ئیتر بۆیە لەو باوەڕەدا بووە کە لەبەر چەند هۆکاری تیۆری و کردەکی ناکرێت و ناشێ مرۆڤ دەستبەرداری ئەم جۆرە بیرەو چالاکییەی بیرە ببێ. ئەو ڕەخنەیەی لە میتافیزیکی کلاسیکی گرتویەتی بەو نیازە بووە میتافیزیك بگەیەنێتە ئاستی زانست. بەپێچەوانەی ئەم هەوڵ و بۆچوونەی کانت کۆڕی ڤیەننا بەگشتی و کارناپ بەتایبەتی هەڵوەشاندنەوەو تێکدانی تەلاری میتافیزیکیان بە پێویست زانیوەو، بۆ ئەم مەبەستە بە یارمەتی لێکۆڵینەوەکانی پێش خۆیان ئامرازی (شیکردنەوەی مەنتیقی زمان)یان داناوەو بەهۆیەوە بێ مانایی و پووچیی ڕستە و تێزەکانی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیان ساغ و پشتڕاست کردۆتەوە. گومان لەوەدانییە کە فەلسەفەی کانت بایەخێکی زانستی و مێژوویی دیار و ئاشکرای هەیە، ڕۆڵێکی لەباری لە مێژووی بیر و فەلسەفەی نوێ و ئەم سەردەمەدا گێڕاوە و بەردی بناغەی فەلسەفەی ڕەخنەیی داناوە. فەلسەفەی کۆڕی ڤیەننا سودی لە لایەن و ڕەوتی ڕەخنەکاریی فەلسەفەی کانت وەرگرتووە، بەبێ ئەوەی ئەو هەلومەرج و بارودۆخە نوێیانە پشتگوێ بخرێن کە فەلسەفەی ئەم کۆڕە تیایاندا سەری هەڵداوە و گۆشکراوە. ئەگەرچی کانت و کۆڕی ڤیەننا لە زۆر بواردا بیروبۆچوونی لە یەکتری جیاوازیان هەبووە بەڵام هەردوو لا زۆرجار هەمان کەرەسە و بابەت و پرسیاریان خستۆتە سەر خوانی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەوە. کانت وەك پێداویستییەکی زانینی زانستیانە بڕوای بەبوونی پرۆپۆزیشن و ڕستەی لێکدراوی پێشیانە هەبووە. کەچی کۆڕی ڤیەننا و کارناپ پوچەڵ کردنەوەی گریمانەی هەبوونی ئەم جۆرە ڕستانەیان بە پێداویستییەکی دانانی بنەمایەکی سەخت و پتەوی زانینی زانستیانە داناوە.

هەردووك لا لەسەر ئەوە کۆکن دەبێ (پێشیانە) لەسەر بنەمای گریمانەکانی پێشتر لێك بدرێتەوە، ئەو گریمانانەی مەرجی پێویستیی زانینن. لەمەوە هەردووك لا ئەو بڕیارە



ئەدەن، ناکرێ و لە تواناادا نییە دەوروبەر لە خۆیدا چییە پێشیانە بزانرێ یان دەرکی پێ ببردرێ. هەروەها لەو باوەڕەدان کە شارەزایی مرۆڤ ئەو بنچینە و ئامرازەیە کە بەهۆیەوە دەکرێ ئەو پرۆپۆزیشن و کێشانە لێك بدرێنەوە کە شت و بابەتەکانی جیهانی سروشتی دەوروبەر دەردەبڕن.

کانت بلیمەتانە لە فەلسەفەی دۆگماتی ڤۆلف و لایبنیتس و ئەزموونی ئینگلیز (دیڤید هیوم) تەلاری ئەو فەلسەفە ترانسندنتالییەی دامەزراند کە لایەنگر و ناحەزانی دەستی ڕێزی بۆ بەسینگەوە دەگرن. لە فەلسەفەکەیدا هەردوو ڕێبازی ژیریی و ئەزموونی نەك هەر یەکیان گرتووە بگرە لە چوارچێوەیەکی تایبەتی بەخۆی دایڕشتونەتەوە. کۆڕی ڤیەننا، بەپێچەوانەوە، ڕێبازی ژیرەکی ڕەت کردۆتەوە و گەڕاوەتەوە بۆ ڕێبازی ئەزموونی هیوم؛ سەرەڕای ئەو سوودەی لە پەرەسەندن و گەشەکردنی زانستەکانی سەردەمی خۆی وەریگرتووە.

کانت لە چوارچێوەی شارەزاییەوە وەك ئامرازێکی شت زانین سەرنجی جیهانی دەوروبەر و بابەتەکانی داوە. کۆڕی ڤیەننا پێکهاتەکانی زمان و مەنتیقی کردوە بە بابەت و کەرەسەی لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە. لەم هەڵوێستەیدا بۆچوونی ڤتگنشتاینی پشت ڕاستکردۆتەوە کە سنوری جیهانی لە چوارچێوەی سنوری زماندا بەدی کردووە.

(سنورەکانی زمان سنورەکانی جیهانەکەم دەستنیشان دەکەن)[٢٩] پشت ئەستور بەو گریمانەیەی ڤتگنشتاین، کوڕی ڤیەننا ئەرکی شیکردنەوەی هێزو توانای ئەقڵی بێگەرد کە لەلایەن کانتەوە خرابووە ئەستۆ، ڕەت دەکاتەوە و ئەرکی سەرەکی فەلسەفە لە چالاکی شیکردنەوەی مەنتیقی زماندا بەگشتی و زمانی زانستدا بەتایبەتی دەبینێ و داوا دەکات لە لێکۆڵینەوەی جیهانی دەوروبەرو ڕووداو بابەتەکانی وەك ئەرکی فەلسەفە دەست هەڵبگیرێ. ئەوی ناکرێ لەبیر بچێ ئەوەیە کارناپ سوودی لە ڕێبازی ماربورگ (کانتیانیزمی نوێ) وەرگرتووە بەتایبەتی لەوەدا ناوەڕۆك و بابەتی زانین لەبیر





دەکەوێتەوە. ئەم بۆچوونە بە ئاشکرا لە کتێبە سەرەکییەکی کارناپدا، *بنیاتنانی مەنتیقییانەی جیهان* دا رەنگی داوەتەوە، بەتایبەتی تیژەی کەوتنەوەی چەمکەکان. کارناپ لەو باوەڕەدابووە کە لە نێوان بابەتەکانی دەوروبەردا (جیهانی بابەتی) و لەنێوان ئەو چەمك و بۆچوونانەی مێشك و بیری مرۆڤ دایان دەرێژن بۆ دەربڕینی ئەو بابەتە جۆربەجۆرانەی دەوروبەر جیاوازییەکی ئەوتۆ نەك هەر نابینرێ بەڵکو هیچ جۆرە جیاوازییەك نییە. دوور نییە ئەم بۆچوونە تارادەیەك ئەوەش بداتە دەست کە لێکۆڵینەوەی مەنتیقی پێکهاتەی زمان وەك ئەوە وایە لە بابەتەکانی جیهانی دەوروبەر بکۆڵێتەوە، چونکە ئەم چەمکانە وەك هیمایەك ئەو بابەتانە دەردەبڕن.

کانت و رێبازی ڤیەننا بە هەردوو لایەنی لەبارو نالەباریانەوە لەم سەردەمەماندا ئەگەرچی بونەتە بەشێکی گرنگ لە مێژووی فەلسەفە، ئەوا هیچ کەسێك لاری لەوە نییە کە هەردووك لایان بوونێکی کردەکی و کاریگەری خۆیان لە چوارچێوەیەکی رێکوپێکی پەرەسەندن و گەشەکردنی شارستانیەتی پڕ شکۆی مرۆڤ تۆمارکردووە، تۆمارکردنێك کە پتر لایەنی لەبار و داهێنان و بەپیزکردنی خەرمانی سامانی گەنجینەی مرۆڤی پێشکەوتوو بەوپەڕی تواناوە نیشان دەدات. فەلسەفەی کانت لەلایەکەوەو ئەنجامی توێژینەوەکانی رابەرانی کۆڕی ڤیەننا چ لە بواری فەلسەفە و تیۆری زانین و چ لە بواری مەنتیق و تیۆری زانستی زانستیانەدا بووبن ئەو بنچینەیەیان لێ پێك هاتووە کە ئەمرۆ مرۆڤی پێشکەوتنخواز، ئەو مرۆڤەی پشت ئەستور بە لایەنە پرشنگدارەکانی رابوردوو سەرنجی دوارۆژ ئەدات و بناغەی پتەوی شارستانیەتی نوێ بنیات دەنێ. هەتا مرۆڤ بمێنێ کانت هەمیشە وەك ئەستێرەیەك لە ئاسمانی پان و بەرین و بەرز و بڵند و شکۆدا دەدرەوشێتەوە.



## پەراوێزکان


1- Kant., Kritik der reinen Vernunft. Vorrede zur ersten Auflage. AXII. 20.

2- Kant., Was ist Aufklaerung. P. 35. In: Werke in Sechs Baenden. Bd. 6. Koenemann. Koeln. 1995. S. 162.

3- Cassirer, Ernst., Die Philosophie der Aufkaerung. Tuebingen 1973. S. 178.

٤- رایشنباخ، هانز. نشأه الفلسفه العلمیه. ت: د. فؤاد زکریا القاهره — ١٩٦٨. ص٥٠.

5- Copleston Fredrick. S. J., Ahistory of Philosophy. Vol. 5. Part 11. P. 80 ff. New Yourk. 1959.

6- Kant., Prolegomena. Vorrede. S. 15. In: Werke. Bd. 3. Koenemann. Koeln 1995.

٧- کانت، رەخنەکردنی ژیری بێگەرد ب- ٣٠ (بە ئەڵمانی).

٨- کانت، پشت ئەستور بە ژان ژاك رۆسۆ، لە چەند شوێنێکی نووسینەکانیدا دووپاتی کردۆتەوە، ئەم بڕیارەی هەر دوو بواری ئاین و ئاکار ناگرێتەوە، چونکە لەم دوو مەیدانەدا هەست و سۆز لەسەرو ژیر و ئەقڵەوەن و بگرە سەرپشك و دەستبەکارن.

٩- کانت، ئیمانۆییل، رەخنەکردنی ژیری بێگەرد (ئەڵمانی) ئا ٧ (پێشەکی).

١٠- کانت، ئیمانۆییل. رەخنەکردنی ژیری بێگەرد، ب ٧٥ — ١٠.

11- Kant, Immanuel., Prolegomena, Vorrede, 257-258.

١٢- کانت، هەمان سەرچاوە بە ئەڵمانی. ل -١٧ بەدواوە.

١٣- هەمان سەرچاوە. ل- ١٣.

14- Kant, I. Grundlegung zur Metaphysik der Sitten. In: Werke in Sechs Bänder. Bd. 3. S. 178. (Koenemann- 1995).






١٥- فەرمانی رەها (موتلەق) وەك كانت لە سێ جێگای ئەو كتێبەیدا كە لە پەراوێزی ژمارە (١٤) نووسراوە، باسی كردووە بریتییە لە ئامۆژگاریەكی باو و كە لە ئاینە ئاسمانیەكاندا و وەك بنچینەیەك پەیڕەو دەكرێ: (تۆ بۆ خۆت چۆنت پێ خۆشە و چۆنت دەوێ، ئاوەها بۆ كەسانی تر پێت خۆشبێ و بتەوێ). كانت وتوویەتی: (بەپێی ئەو بنەمایە رەفتار بكە كە تۆ خۆت دەتەوێ ببێ بە قانونێكی گشتی هەموو كەس بگرێتەوە. ل — ٢١٥، ٤٢١) یاخود (وا رەفتار بكە وەك ئەوەی بنچینەی رەفتارەكەت بەهۆی خواستتەوە ببێ بە قانونێكی گشتی سروشتیی. ل-٢١٦، ٤٢١) یان: با رەفتارەكەت بە جۆرێك بێ وەك ئەوەی بتەوێ مرۆڤایەتی لە كەسی خۆتدا و لە كەسایەتی هەر یەكێكی تردا هەموو كاتێك بەچاوی ئامانج نەك وەك ئامراز تەماشای بكەی و بەكاری بهێنی. ل٢٢٦، ٤٢٩.

16- Kant, I. Prolegomena. S. 132 (353).

١٧- كانت، هەمان سەرچاوە بە ئەڵمانی ل- ١٥٠ (٣٦٧).

18- Kant., K. d. r. v. Einleitung. A. 2-30.

١٩- لە سەردەمی عەبباسییەكاندا كە فەلسەفەی یۆنانی بەگشتی و مەنتیق ئیساغۆجی بەتایبەتی تەرجەمەكران (ئیساغۆجی لە وشەی یۆنانی ئیزاگۆگێ وەرگیراوە و مانای دەروازە و سەرەتا دەگەیەنێ). لە مەنتیقدا هەردوو وشە ئەوروپاییەكە:

– Subjekt واتە (ناو — بكەر) بە موضوع (بابەت).

– Praedikat (خەبەر) بە مەحمول (بار) كراون بە عەرەبی بۆ ئەوەی مەنتیق و چەمكەكانی لە رێزمان و چەمكەكانی جیا بكرێنەوە. بە باوەڕی من دەكرێ سوود لە دوو وشە عەرەبییەكە وەربگیرێ.

– پرۆفیسۆر دكتۆر محەمەد مەعروف مامۆستای زمان لە كۆلێجی ئاداب — هەولێر، ئاگاداری كردمەوە كە مامۆستا تۆفیق وەهبی بۆ وشەی سەبجێكت: وشەی (بنە) و بۆ پرێدیكات: وشەی (بار)ی بەكارهێناوە. ئەم نووسینە، ئەوكاتە لەژێر چاپدا بوو، بۆیە بەداخەوە نەمتوانی ئەم دوو وشە كوردییە رەسەنە بەكاربهێنم.

20- Kant, I., Prolegomena. S. 37- (278).

٢١- كانت، هەمان سەرچاوە. بە ئەڵمانی. ل -٢٥ (٢٦٨-٢٦٩).



22- Wiener Kreis., Wissenschaftliche Weltauffassung. Wien 1929. S. 15.

23- Carnap, R., Schein Probleme der Philosophie 1928.

- Ueberwindung der Metaphysik durch die Logische Analyse der Sprache. In: Erkenntnis. Bd. 2 Leipzig 1932.

- Der Logische Aufbau der Welt Berlin 1928.

٢٤- كارناپ، پووچەڵ كردنەوەی میتافیزیك (ئەڵمانی) ل ٢٢٩. تێكستەكەی هایدیگەر ئەمەیە: پێویستە بە تەنیا بوونەوەر ببێ بە بابەتی لێكۆڵینەوە و هیچی تر. تەنیا بوونەوەر و هیچی تر نا- تاكە بوونەوەر بە تەنیا و لەو بەولاوە هیچی تر- ئایا هەر - هیچ - هەیە چونكە نا یاخود ناكردن هەیە؟ یاخود بابەتەكە بەپێچەوانەوەیە؟ ئایا تەنیا ناكردن و - نا- هەیە چونكە - هیچ - هەیە؟ ئێمە ئەولافە لێ ئەدەین: - هیچ - بنەرەتە وەك - نا - و ناكردن. لە چ جێگایەك بەدوای -هیچ-دا بگەڕێین؟ لە كوێ — هیچ — ئەدۆزینەوە؟ ئێمە — هیچ — دەناسین و دەیزانین — هیچ — لە پەشێوی و ترسەوە پەیدا دەبێ، لەچی و بۆچی پەشێوی ترس دامان دەگرێ؟ ئایا ئەمە بەتایبەتی — هیچ —ە. ئەوی راست بێ — هیچ — خۆی وەك — هیچ — لێرەیە بووە — ئایا هیچ لەچی دایە — هیچ هەرخۆی بۆخۆی دەكاتەوە بە هیچ.

-Heidegger, M., Was ist Metaphysik. 1929.

تەواوی ئەم باسە كراوە بە كوردی و لە گۆڤاری -رامان- هەولێر بلاوكراوەتەوە: گۆڤاری رامان- ژمارە-٩٥ هەولێر ٢٠٠٥.

٢٥- كارناپ: پووچەڵ كردنەوە... بە ئەڵمانی ل- ٢٢٠.

٢٦- كارناپ، هەمان سەرچاوە. ل ٢٤٠.

27- Stegmueller, W., Hauptstroemungen der Gegenwarts Philosophie. Bd. I. Stuttgart 1978. S. 386.

28- Carnap, R., Der Raum. Ein Beirtag zur Wissenschaftslehre. Berlin 1922. S. 65.

29- Wittgenstein, Ludwig., Tractatus Logico – Philosophicus. 5. 6.





## (٣)

## فەلسەفە یان زانست؟

١- هەر کە باسی فەلسەفەی کۆڕی ڤیەننای ئەزموونی مەنتیقی دەکرێ، بەتایبەتی دوای جەنگی دووەمی جیهان، دوو بۆچوونی نالەبار هەست پێ دەکرێن.

- کوڕی ڤیەننا مردوە و ئەو فەلسەفەیەی ئێستا لە چەند کۆڕ و کۆمەڵ و زانکۆیەکی ئەوروپا و ئەمەریکادا باوە بەناوی ئیمپریزمی مەنتیقی، پۆزیتیڤیزمی نوێ، پۆزیتیڤیزمی مەنتیقی یاخود فەلسەفەی شیکردنەوەی مەنتیقی، زۆر لەو بابەت و کێشە و مەسەلانە جیاوازن لەکاتی خۆی لە کۆڕی ڤیەننادا باسکراون.

- ئەم بزوتنەوەیە هەر لە سەرەتای پەیدابوونیەوە هەوڵێکی ڕێکوپێکبووە بۆ لەناوبردنی فەلسەفە یاخود بۆ بێ پێزکردنی بەجۆرێك ببێ بە پاشکۆی زانستییە ئەزموونییەکان یاخود وای لێ بکرێ زانستەکان دەستبەرداری بن و پەکیان لەسەری نەکەوێت.

بە باوەڕی من هەردوو بۆچوونەکە لە جێگای خۆیاندا نین. چونکە فەلسەفە و بیروبۆچوونی فەلسەفەیی وەك ئایدیۆلۆجی کە جۆرێکە لە هەستی کۆمەڵایەتی بەندە بە کات و شوێنی دیاریکراو و فاکتەر و ئەجندەی تایبەتی خۆی هەیە. هەر بزوتنەوەیەکی فەلسەفەیی کە دەرکەوتبێ و پەیدابووبێ کۆڕپەی ئەو دەوروبەر و کۆڕو کۆمەڵە بووە کە تیایدا گۆش بووە، بە شێوەیەکی تایبەتی بارودۆخی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانستی سەردەمی خۆی و داهاتە سەرتاپاگیرە زانستییەکانی دەوروبەری خۆی دەردەبڕێ. ئەو بارودۆخەی ئەم کۆڕە فەلسەفەییە تیایدا سەریهەڵدا، وەك ئەنجامێك ناچاری کرد، بگرە دەبوو جارێکی تر لە فەلسەفە بە مانا باو و کلاسیکییەکەی، وردببێتەوە، سەرلەنوێ ئامراز و ئامانجەکانی





مشتومالْ بکاتەوە. ئەنجامێکیش کە لەم پرۆسەیە کەوتەوە، پشتکردنە شێوە کۆنە کلاسیکییەکەی فەلسەفە و دیاریکردنی روخسار و ناوەڕۆکێکی تر بوو بۆ ئەو چوست و چالاکییەی مرۆڤ کە بە فەلسەفە و فەلسەفەکردن ناودەبرێ. لەسەردەمی هەردوو شۆڕشی جیهانگیریی تیۆریی ڕێژەیی ئەلبێرت ئاینشتاین و تیۆری گۆانتەمی هایزنبێرگ... هتد. ناکرێ و ناگونجێ فەیلەسوف وەك جاران بەهۆی رامان و سەرنجدان و زەین رونیییەوە بۆچوون و مەزەندەکانی خۆی بەبێ سوود وەرگرتن لە گۆڕانە سەرتاپاگیرە زانستی و ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان کە ژیان و جیهانیان هەژاندووە لە سیستەمێکی پەسندی فەلسەفەییدا دابڕێژێ.

فەلسەفەی کۆڕی ڤیەننا نەمردووە. بارودۆخی سیاسی ئەوسای ئەڵمانیا، داگیرکردنی نەمسا لەلایەن لەشکری ناسیۆنال سۆسیالیزم و بەستنەوە بە ئەڵمانیا کوڕەکەی خستە بەردەم دوو ڕیانێك کە ناچارەکی بوو. بەو تۆمەتەی گوایە رابەری ئەم ڕێبازە بیروبۆچوونی نزیك بە سۆسیال دیموکراتیان هەبوە کۆڕەکەیان داخراوە و خۆشیان ناچارکراون ولاتەکەیان بەجێ بهێڵن. زۆربەی هەرە زۆریان روویان کردۆتە هۆڵەندە و ئینگلتەرە ئینجا ئەمەریکا. مۆریتس شلیك سەرۆك و دامەزرێنەر لە بارودۆخێکی ئالۆزدا ژیانی لێ ستێنراوە.

لە بەریتانیا و ئەمەریکادا نەریتێکی فەلسەفەیی هەبووە کە لە کۆنەوە باوبووە وەك ئەزموونی و فەلسەفەی شیکردنەوەی زمان —ناسراو بە لینگویستیك- لە ئەمەریکاش سەرەڕای ئەم لایەنە پراگماتیزم و رێئالیزم لە سەرانسەری کۆڕ و ئەکادیمیە زانستییەکاندا باو و دەست بالابوون. لەم دوو وڵاتەدا فەلسەفەی هاتووی کۆڕی ڤیەننا تێکەڵ و ئاوێتەی ئەم ڕێبازە جیاوازە جۆربەجۆرانە بووە و شێوە و ناوەڕۆکەکەی گۆڕانی بەسەرداهاتوە. تەنانەت ناوەکەشی بوو بە ئەزموونی مەنتیقی یان لە هەندێ شوێندا پۆزیتیڤیزمی مەنتیقی کە بەگشتی لە سەرچاوەکەیان دوور کەوتوونەتەوە و سروشتێکی شیکردنەوەی مەنتیقی زمان و تیۆری زانینی

زانستیانە و مەنتیقی بیرکاریان پێ براوە. کوڕی ڤیەننا و بیروبۆچوون و چالاکییەکانی بوون بە بەشێك لە رابردو و ئالقە و قۆناغێکی گرنگی مێژووی فەلسەفە. ئەو کێشانەی کاتی خۆی مێشکی فەیلەسوفەکان پێوەی خەریك بوون ئێستاکە بەشێکن لە رابردو و مێژوو، بەلاّم رابردو و مێژوویەکی بەپێزو و زیندو کە وەك بنەماوبنجدارو پەردو و نەمامی ئەمرۆی فەلسەفەیان لەسەر شین ببێ.

فەلسەفە بە پێچەوانەی زانستەوە، مێژووی تایبەتی خۆی هەیە، مێژووی زانست بەهیچ جۆرێك زانست نییە، بەلاّم لە فەلسەفەدا ئەمە بەلایەکی تردا شکاوەتەوە مێژووی فەلسەفە، یەکەم، لە خۆیدا فەلسەفەیە و دووەم مێژووە. من خۆم وای بۆ دەچم و لەو باوەڕەدام کە مێژوو، رابردو و تەنیا هەر ئەوەنین لە خۆیاندا کاتی خۆی چی و چۆن بوون، مێژوو بەمانا گشتییەکەی لە بۆچوونی فەلسەفەوە، من وای تێدەگەم، ئەوەیە مرۆڤ چ جۆرە وێنە و بۆچوونێکی لەبارەیەوە لە ناخ و مێشکدا هەیە، تا چ رادەیەك مێژوو خۆی دەتوانێ بەو تاقیکردنەوە جۆربەجۆرانەی کردونی، بەو رووداوانەی بەسەریدا هاتوون، بوونی کردەکی خۆی لەسەردەمدا بەجۆرێك ساغ و پشتڕاستبکاتەوە کە توندوتۆڵ بە رەوشی بیر و شارستانیەتی دوای خۆیەوە ببەسترێتەوە.

٢- ئەگەر سەرنجێك لەو بەرهەمانە بدرێت کە رابەرانی کۆڕەکە لە ژێر ناوی بلاّوکراوەی رێکخراوی (یەك رەنگی زانست) یاخود (کۆمەڵەی ئێرنست ماخ) یان لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری جاران ئەڵمانی زمان «زانین»دا بلاّویان کردۆتەوە بۆمان دەردەکەوێ کۆڕی ڤیەننا بەچاوێکی تر تەماشای فەلسەفە و ناوەڕۆك و بابەت و ئەرك و ئامرازەکانی کردوە، بەچاوێك کە جۆرە سنور بۆ دانانێك بەدی دەکرێت، بەتایبەتی بۆ ئەو کێشە و بابەتانەی فەلسەفە کە لە سەدەی کۆڕەکەدا نەکراوە بە ئامرازە کلاسیکییەکانی فەلسەفە شیبکرێنەوەو بەلایەکدا بخرێن. ئەم جۆرە سنور بۆ رشتنە ئەنجامێك بووە لە پەرەسەندنی زانستی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم و



ئاشبەتاڵیکردنی فەلسەفەی ئایدیالیستی ئەڵمان و سەرلەنوێ پەیدابوونەوەی فەلسەفەوە کەوتۆتەوە.

لە مێژووی نوێی فەلسەفەدا چەندین هەوڵی جوامێرانە بەدی دەکرێ کە بۆ بەزانستیکردنی فەلسەفە دراوە، دواجار ئەو کۆششەی کانت بوو بۆ رەنگ ڕشتنی بنچینەیەکی پتەوی زانستییانە بۆ میتافیزیك. بەلاّم وەك ئاشکرایە کۆششەکە سەری نەگرت میتافیزیك نەبوو بە زانست لەبەر چەند هۆیەك لێرەدا بوار و مەودای باسکردنیان نییە.

دوا کۆششی بەزانستی کردنی فەلسەفە ئەوەبوو لەلایەن کۆڕی ڤیەنناوە کراوە، کۆششێك کە سەرجەمی فەلسەفە بە ناوەڕۆك و روخسارەوە لە تیۆری زانین و فەلسەفەدا ببینێ، فەلسەفەیەك خزمەتی سود و قازانجی بەرەو پێش چوونی زانست و زانایان بکات. ئەوی لێرەدا سەرنج رادەکێشێ، هەمیشە هەوڵ دراوە سەربەخۆیی فەلسەفە زەوت بکرێت، بکرێت بە پاشکۆی بابەتێکی تر، ئیتر ئەم بابەتە لاهوت بووبێ یاخود سیاسەت و ئابوری یان زانست، وەك ئەوەی ئەم بەپاشکۆکردنە سوودی فەلسەفە و ژیان و کۆمەڵی تیادابێ. بۆ نموونە فەیلەسوفێکی بەناوبانگی سەدەی نۆزدەهەم وای دادەنا ئەگەر فەلسەفە وەك سیاسەت دەست بەدامێنی ئابورییەوە بگرێ و ئەرکە تیۆرییەکەی سەرشانی بە ئەرکێکی تر بگۆڕێ «لە کلۆڵی» قوتاری دەبێ. کەچی فەلسەفە هەر مایەوە و رێژیمە ئابوری و سیاسیەکەی بە هەق یاخود بە ناهەق ناوی ئەو فەیلەسوفەی بەسەردا بڕابوو ماڵ ئاوایی کرد. ئەوەی پەیوەندی بە هەوڵەکەی کۆڕی ڤیەنناوە هەیە، بەپێی بیروبۆچوونی ئەم فەیلەسوفانە، ناکرێ فەلسەفە تەنیا سەرگەرمی چارەسەرکردنی کێشەی هەندەکی بێت لەلایەکی ترەوە، لەبەر بایەخ و گرنگیی ئەو کێشە هەندەکییانەی کە جاران فەلسەفە سەرقاڵی توێژینەوەیان بووە ناکرێ و ناتوانێ دەستبەرداری وەلاّم و چارەسەر و ئەنجامەکانی زانستییە سروشتی و فۆرمەکیەکان ببێ. هەروەها لەلایەکی

تریەوە زانست ناتوانێ لەو ئامرازانەی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە، وەك مەنتیقی بیرکاری و شیکردنەوەی مەنتیقییانە کە فەلسەفە دوای کۆششێکی زۆری رابەرانی وەك فرێگە... دەیانداتە دەست، لێیان بێ نیاز و و بێ منەت بێت.

وەك لە بلاۆکراوەکانی ئەم رێبازەدا دەردەکەوێ، شتی نوێ و نوێکردنەوە کە وەك بابەت لەلایەن ئەم کۆڕەوە کراوە بریتی بووە لە پەیڕەو (میتۆدە) کە لە مەیدانی چالاکی فەلسەفەدا پشتیان پێ بەستوە و سروشتی فەلسەفەکەیانی بە روخسار و ناوەڕۆکەوە دەست نیشان کردووە، واتە پەیڕەو نەك بابەت و کەرەسەی فەلسەفە بنەمای چالاکی ئەم رێبازە و رابەرەکانی بووە. هەر بۆیە یەکەم لێکۆڵینەوەیەك کە شلیك، رابەری کۆڕەکە لە یەکەم ژمارەی «زانین»دا بلاۆی کردۆتەوە لەژێر ناوی (بارگۆڕینی فەلسەفە) بووە[1]. بارگۆڕینێك فەلسەفەی بەلایەکی تردا وەرچەرخاندوە سروشتێکی تری بۆ ناوەڕۆك و روخسار و ئەرکی سەرشانی دیاریکردووە. لە بەرامبەر زانستەکان بەگشتی و زانستی سروشتیدا سنورێکی تایبەتی بۆ داناوە. لەو باسەیدا مۆریتس شلیك وتویەتی: (من بە تەواوەتی بڕوام وایە... لەم سەردەمەماندا گۆڕانێکی سەرتاپاگیر بەسەر فەلسەفەدا هاتووە... ئەم سەردەمەمان کەرەسە و ئامرازی ئەوتۆی بەدەستەوەیە بتوانێ بەیەگجاریی کێشەکان بەلایەکدا بخات.... ل٥). ئەو پرسیارانەی لەم سەردەمەدا رووبەرووی فەلسەفە دەبنەوە بەگشتی بەم جۆرە دادەڕێژرێن: ئایا زانینێکی راست هەیە کە دڵنیایی لێ بکرێت و بواری دل کرمێ بوون نەدات؟ ئەگەر ئەم زانینە هەیە چۆنە و لەچی پێك دێت؟ پرۆفیسۆر شلیك لەو باوەڕەدا بووە کە چەند بابەتێکی سەرەکی فەلسەفەی کلاسیك (ئێستاکە باویان نەماوە... بۆ نموونە، کێشەی بڕکردن و سنوری زانین بە لەلایەکدا خراون. ل٧). فەلسەفە رەنگ و روخساری جارانی نەماوە و ئەرکی تازەی کەوتۆتە سەرشان، پەیوەندی نوێی گەرم و گوڕی لەگەڵ زانستەکاندا هەیە. ئەو پەیوەندییە وایکردوە ئەرکی فەلسەفە شیکردنەوە و روونکردنەوەی زمان و چەمك و تیۆری و شێوەی



دەربڕینی زانست و زمانی زاناکان بێت لەگەڵ بایەخدان بە مەنتیق و لایەنی پێکهاتەی مەنتیقییانەی زمانی کێشە و بابەتەکانی فەلسەفە. مەنتیق، لەم روانگەیەوە پەیڕەوی فەلسەفەکردن و جێبەجێکردنی ئەرکی چالاکی فەلسەفەیە.

ئەوی لێرەدا دەبێتە مایەی ئەگەر و گومان و نارەحەتی ئەوەیە، دوو بابەتی لە یەکتری جیاواز بخەیتە ناو دوو تای تەرازویەکەوە. دوو بابەت لە کەرەسە و روخسار و ئەرکی سەرشان و ئامانجدا لە یەکتری جیاوازن. ئەگەر بکرێن بەیەك یاخود یەکێکیان سروشتی ئەوی تریانی بەسەردا بسەپێنرێ ئەو شتە و بابەتەی جاران نامێنێ. زانست زۆر لە فەلسەفە جیاوازترە. هەست و سۆز و هۆش لە زانستدا، بەپێچەوانەی فەلسەفەوە ئەو دەورە ناگێڕن. سەرنجدان و تاقیکردنەوە ئامرازی زانستن. جۆرە رەوشێکی دەستبەکاری چالاك و کاریگەرن ئەنجامی دیار و هەست پێ کراویان لێ دەکەوێتەوە. لە پرۆسەی سەرنجداندا، ناوەڕۆکی هەستێك دەبێ بە بابەت، بابەتێك کە لەبەر دەستدا نییە بەڵکو رێ بۆ کەوتنەوە و پەیدابوونی خۆش دەکرێت. ئەم کارەی سەرنجدانە هەمیشە مەبەستێکی لە پێشەوەیە، ئیتر ئەو مەبەستە پرسیار بێت کە بەبیری زانادا دێت یاخود کێشەیەکی تیۆرییە دەبێ بەلایەکدا بخرێ و لە بەرگی گریمانەیەکدا بنەخشێنرێ. هەروەها پشت بە چەند بنەماو بنچینەیەك دەبەستێ. ئەو ئەنجامانەی دەکەونەوە دەکرێ وەك چەند ڕستەیەك، چەند هاوکێشەیەك سەرنج بدرێن کە جۆرە پێشبینی کردنێکیان تیادایە و دەکرێ بەهۆی پێودانگی تایبەتییەوە راستی و ناراستییان ساغ و پشتڕاست بکرێتەوە.

٣- سەدەی هەژدە و نۆزدەهەم بە قۆناغی رەخنە و شیکردنەوە ناسراون، شیکردنەوەی زانین و رەخنەکردنی ئەقڵ و ئایین و دام و دەزگاکانی لاهوت و ئەو بیروبۆچوون و ئایدیۆلۆجییەی لێیان کەوتبوونەوە، رەخنەکردنی سیستەم و رژێمە سیاسی و کۆمەلاێەتییە جیاوازەکان لە بەرهەمەکانی فەیلەسوف و بیرمەندانی ئەم دوو سەدەیەدا بەرچاو دەکەون. ئەقڵ پوختە و جەوهەری مرۆڤە و ئەریستۆ وتەنی،





هەر ئەم جەوهەرەیە مرۆڤ لە بوونەوەر و زیندەوەرەکانی تر جیادەکاتەوە. ئامرازێکی کاریگەری زانین و کاروبارەکانی ژیان و جیهانە. پێودانگی گومان لێ نەکراوی هەلاوێردن و لە یەکتری جیاکردنەوەی راست و هەڵە و چاکە و بەدکاریی و جوانی و دزێوی و شیرینی و ناحەزییە. ئەمە پوختەی ئەو بۆچوونە فەلسەفییە بوو کە لەلای فەیلەسوفی پایەبەرزی ئەڵمان داهێنەری فەلسەفەی ترانسندنتالی ئیمانۆییل کانت خەت و خاڵی داوە. کانت لە فەلسەفەکەیدا مرۆڤ و جیهانی دەوروبەر وەك دوو تای تەرازوو بەرامبەر کردوە و گەیشتۆتە ئەو بڕیارە دلێرانەیە کە مرۆڤ ناوەند و مەڵبەند و سەرپشکە، ژیر (ئەقڵ) بنەما و سەرچاوە و بنەڕەت و بنچینەی هەموو زانین و شت زانینێکە بە هەموو جۆر و چەشنەکانیەوە، هەڵوێستی کانت دەربارەی ژیر و ئەو رۆڵەی لە زانیندا دەیگێڕێ بریتییە لە هەڵگێڕانەوە و بەراوەژوکردنەوەی ئەو بۆچوونانەی تا سەردەمی خۆی باوبوون. ئەم هەڵوێستەی خۆی بەجۆرە شۆڕشێك ناوبردوە کە لە هی کۆپەرنیکۆس چووە. بۆ لێکدانەوەی قانون و بنەماکانی ژیر نابێ مرۆڤ لەنێو شت و بابەتەکانی دەوروبەردا بەدوای ئامرازێك، بنەمایەکدا بگەرێ، ناکرێ و ناگونجێ لەنێو دەوروبەر و شتەکانیدا بەدوای لێکدانەوەی قانونەکانی ئەقڵدا بگەڕێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەبێ لەنێو ئەقڵدا، وەك چالاکی و هێز و توانا، بەدوای لێکدانەوەی شتومەك و بابەتەکانی دەوروبەردا بگەڕێ. ئەقڵ سەرپشك و دەوروبەر پابەندی قانون و بنەماکانی ژیرە. ئەم بۆچوونە بە تەواوەتی بەپێچەوانەی داب و دەستوری بیرکردنەوەی پێش خۆی بووە، بۆیە دەکرێ ئەم هەنگاوە بە وەرچەرخانی کۆپەرنیکی ناوبردرێ.

زانینی راستەقینە بریتییە لە بڕیاردان و لە جۆرە (حوکم)ێك کە کار و چالاکییەکی ژیرییە و دوو بەهای هەیە، راست یاخود ناراست (درۆ)، ئیتر لەمەوە کەوتە ئەو بارەی لە جۆرەکانی بڕیار بپێچێتەوەو نیشانی بدات کامانەن ئەو بڕیارانەی بنچینەی زانستیان لێ پێك دێت. بڕیار دووجۆرە: شیکاری و لێکدراو (تەرکیبی). لەلایەکی ترەوە کانت تای تەرازوەکە بەرامبەر دەکات و لایەنێکی تری ژیر کە لایەنە نا لە بارەکەیەتی دەخاتە ژێر نەشتەری توێ توێ کردنەوە.



ژیری مرۆڤ، سەرەڕای ئەو توانا و هێز و لێهاتوییەی، رێگای بەخۆی داوە خۆی لە چەند بابەتێکەوە بگلێنێ کە لە توانایدا نییە بەلایەکیان دابخات، چونکە لە سنوری دەسەلاَت و تواناکەی بەدەرن، ئەگەر بیەوێ لێکیان بداتەوە دەکەوێتە نێو چاڵی ناکۆکی و ناتەبایی، کەچی واز ناهێنێ و بەردەوام خۆیان پێوە خەریك دەکات. ئەمانە بابەتی میتافیزیکن بەتایبەتی کێشەی، خوا، ئازادی خواست، نەفس و نەمریی[٢]. بەواتایەکی تر سروشتی ژیری مرۆڤ بەو جۆرەیە کە هەمیشە لە سنور و رادەی توانای خۆی تێپەڕێنێ و سنور و مەودای بڕکردنی ببەزێنێ[*].

خۆی بە چەند کێشە و بابەتێکەوە خەریك دەکات کە لە توانایدا نییە بەشێوەیەکی زانستییانە کە دڵ ئاو لە ئەنجامەکانی بخواتەوە، وەلاَمی پرسیارەکان بداتە و گرێ کوێرەکان بکاتەوەو کێشەکان بەلایەکدا بخات. ئەمانە بابەتی میتافیزیکن، کەوابوو بەپێی ئەو بڕیار و بۆچوونەی کانت میتافیزیك بۆ مرۆڤ شتێکی چارەنوسییە. ژیانی ئاکارەکی، ئەو ژیانەی دوور بێ لە بەدکاریی، فراوانکردنی ناوەڕۆك و توانا و سنوری ئەو شتانەی دەربارەی جیهان بەتایبەتی و زانین بەگشتی دەیزانین بوونی میتافیزیك پشتڕاست دەکەنەوە و بگرە دەیکەن بەشتێکی پێویست.

ئەگەر میتافیزیك بۆ ژیانی مرۆڤ شتێکی پێویست و ناچارەکی بێ، دەبێ بۆچی وەك لقەکانی تری چالاکی گیانیی مرۆڤ بەتایبەتی وەك زانستەکان پەرەی نەسەندوە و بەرەو پێش نەچووبێ؟

ئەگەر سەرنجی زانست و میتافیزیك بدەین، ئیتر چ لە مەبەست، بابەت و ناوەڕۆك چ لە پەیڕەو رێبازدا دوو بابەتی ئاسمان و زەوی لە یەکتری جیاوازن.

بابەتەکانی میتافیزیك لەو پرسیارانە دەکەونەوە کە دەیانکات وەك: ئایا جیهانی بوون، سەرەتایەکی دیاریکراو و کۆتایی هەیە یان نا؟ ژیان و مرۆڤ لە چییەوە پەیدابوون؟ دەبێ بۆچی جیهان کۆن و بێ سەرەتا نەبێ و ئینجا بێ کۆتایی؟ بۆچی





دەبێ نەمریی نەبێت؟ ئەم پرسیارانە کە ژیر خۆیان تێوەدەگلێنێ و ناچاریشە هەردەبێ بیانکات، ناتوانێ وەڵامیان بداتەوە چونکە لە سنوری توانای خۆی تێدەپەڕن و ئەگەر هەوڵیدا وەڵامیان بداتەوە ئەوا خۆی دووچاری ناتەبایی و ناکۆکی و قسەی دژ بەیەکتری و بەپێچەوانەی یەکتری دەبێت. ئەگەر سەرنجی وەڵامی ڕابەرانی میتافیزیك لەم بارەیەوە بدرێت لەناو وەڵامەکانیاندا کۆمەڵێك ناکۆکی و ناتەبایی و بۆچوونی دژ بەیەکتری بەدی دەکرێن مرۆڤ، سروشت ئاسا، دەیەوێ دەربارەی بابەتی ئەو پرسیارانەی لەناخیدا وروژاون و نارەحەتیان کردوە، ئەوەندەی دەکرێ و لەتوانایدایە کرمی گومان لە دڵ دەربکات، شتبزانێ، ئەگەر نا سنورداریی و هێز و توانای مەودا دیاریکراوی ژیری بۆ دەردەکەوێ کە زۆرجار لە شێوەی ئەم پرسیارەدا خۆی دەنوێنێ: چۆن میتافیزیك وەك زانست لە کردن دێت؟ ئایا دەکرێ میتافیزیك وەك زانستی لێ بێت؟ ئەگەر بابەتی جیاواز بکات بە کەرەسەی خۆی ناکرێ هەمان ئامراز و پەیڕەوی ورد و ڕێکوپێکی زانست بەکاربهێنێ؟ ئایا لەم پرسیارانەوە وەك گریمانە جۆرە ئەگەر و گومانێك لە بوونی میتافیزیك ناکەوێتەوە و دڵ لە ڕەواییەکەی کرمێ ناکات؟ ئایا ڕاستە وەك کانت وتەنی، هۆی دواکەوتنی میتافیزیك لە چاو زانست لەوەوەیە کە ژیر جۆرە دوو ڕەنگییەك، بانێکەو دوو هەوا پیادە دەکات. لە میتافیزیکدا ژیر ڕێگا بەخۆی دەدات دەست لە هەموو شتێك وەربدات و هەموو سنور و ڕادە و مەودایەك ببەزێنێ و تێپەڕێنی کەچی کە دێتە سەر باری زانست و دنیا و بابەتی زانست ئەو مافە بەخۆی نادات لە سنوری بیرکردنەوەی ڕیالیستی و ئەزموون و تاقیکردنەوە تێپەڕێنێ(٣). لە میتافیزیك و بابەت و پرسیار و لێکۆڵینەوەکانیدا ئازادی تەواوەتی هەیە و لە هەموو شتێك تێدەپەڕێنێ کەچی لە زانستدا ئەمە ناکات و ڕیالیستییانە کاردەکات. بۆیە ناچارین، کانت وتەنی، ورد و زانستییانە توانا و هێزی ژیر بخەینە ژێر نەشتەری شیکردنەوە و توێ توێ کردن بۆ ئەوەی سروشت و پوختە و جەوهەر و بڕیار و حوکم و کەلەبەرەکانی بەگشتی شارەزابین و بیزانین. ئامرازی کارکردنمان لەم



ئەرکەدا هەر ئەقڵ خۆیەتی. کەوابوو ئەقڵ دوو دەور دەگێڕێ جارێکیان وەك دادوەر (قازی) جارێکیشیان ئەو لایەنەیە کە دادگایی دەکرێ بۆ ئەوەی سروشتەکەی دەست نیشان بکرێت. لەم ئەرکەدا ئەقڵ خۆی پزیشکی خۆیەتی و بەوە پشت ئەستورە کە بیر و وردبوونەوەی ژیرەکی لە تواناییاندا هەیە، بەهێز و توانای تایبەتی خۆیان — ڕەنگی سیستەمێکی ڕێکوپێکی باڵەخانە ئاسایی زانین بڕێژن و وێنەیەکی سەرتاپاگیریی، جیهانبینی، بوون و جیهان بدەنە دەست.

من، ئەو ڕەخنەیەی لە زۆر لاوە، لەم بۆچوون و هەڵوێستەی کانت گیراوە بەرەوا نازانم. ڕەخنەکە بەم جۆرەیە، دادوەر (قازی) ئەگەر تۆمەتی درایە پاڵ ناکرێ بۆ خۆی خۆی دادگایی بکات، ئەگەر پزیشك نەخۆش بوو پزیشکی تر داو و دەرمانی دەکات. ژیر دەبێ دادوەر بێ یان تاوانبار کراو، ناکرێ لە یەك کاتدا هەردووکیان بێت. ئەم ڕەخنەیە فرە لایەنی بیروبۆچوون، هەمەرەنگیی توانا و هێز و کاریگەریی مێشك و ژیر پشتگوێ دەخات. ئەو ژیرەی لە ژیانی مرۆڤدا، هەر لە سەردەمی کۆنی یۆنانەوە ئەو شارەستانیە بڵند و شکۆمەندەی لێ کەوتبێتەوە دەبێ، کانت وتەنی، بۆ نەتوانێ دوو دەور و بگرە پتر بگێڕێ. ئەگەر ژیر توانیبێ میتافیزیك و زانست دابهێنێ کە دوو بابەت و چالاکی لە یەکتری جیان هەر بەهەمان شێوە دەتوانێ دوو ڕۆڵی لە یەکتری جیا بگێڕێ(**).

بیروبۆچوونی کانت دەربارەی کێشەی میتافیزیك و دەوری ژیر و تیۆری زانین بەتایبەتی زانینی دەوروبەر (واقیع) و ڕستە و پرۆپۆزیشنی لێکدراوی پێشیانە لەلایەن ڕێبازەکانی فەلسەفەی سەدەی بیستەم کاردانەوەی جیاواز و هەمە چەشنەی هەبووە. بگرە ڕێبازێکی فەلسەفە نابینرێ کە بەشێوەیەك لە شێوەکانی سەرگەرمی شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتانەی کانت نەبووبێ(٤). ڕێبازی کانتیانیزمی نوێی ماربۆرگ کە سەرگەرمی ئەوەبوو فەلسەفەی کانت لە لایەنە نازانستییەکانی، بەتایبەتی تێزەی شت لە خۆیدا، بژار و مشتومالّ بکات، برینتانۆ، فینۆمینۆلۆجیی





هوسەرڵ و لایەنگرانی و ئینجا کۆڕی ڤیەننا ئەزموونی مەنتیقی. هەر ڕێبازێك لەم ڕێبازانە لە بۆچوونی تایبەتی فەلسەفەیی خۆیەوە، ئیتر پشتڕاستکردنەوە بووبێ یاخود پەرەپێدان و چاککردن تادەگاتە ڕەتکردنەوەی تەواو ئینجا هەوڵ دان بۆ پووچەڵکردنەوەی، هەڵوێستی فەلسەفەیی خۆیانیان بەدەرخستوە. بۆ نموونە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە ڕێبازی ماربورگ بۆچوونەکانی کانتی دەربارەی زانین و تیۆری زانین پشتڕاستکردۆتەوەو وای داناوە کە دەکرێ فەلسەفە خۆی بە کەرەسە و بابەتەکانی تیۆری زانینەوە خەریك بکات، دەستبەرداری میتافیزیك ببێت و بابەتی «ڕاستی و ڕاستەقینەیی جیهانی دەوروبەر» بکات بە سەربابەت و سەرپشك و بنەمای لێکۆڵینەوەکانی. کەچی ئیدمۆند هوسەرڵ و لایەنگیرانی پێیان لەسەر ئەوە داگرتوە کە ئەم کێشەیە لەخۆیدا وا بە ئاسانی بەلایەکدا ناخرێ و دەبێ بوونی «جیهانی دەوروبەر» بخرێتە ناو دوو کەوانەوە و نیشانەی پرسیاری لەبەردەمدا قیت بکرێتەوە و مرۆڤ بڕیار و حوکم نەدات. ئەمەیە تێزەکەی هۆسەرل کە لە هەموو کۆڕ و کۆمەڵە زانستی و فەلسەفییەکانی ئەوروپادا دەنگی داوەتەوە و بە «خۆ بواردن لە بڕیاردان» ناسراوە:Sich des Urteiles enthalten

کۆڕی ڤیەننا، بەجۆرێکی تر هەڵوێستی خۆی دیاریکردوە کە بەتێکڕایی لە ڕێبازەکانی تری فەلسەفە جیای ئەکاتەوە. ئەزموونی مەنتیقی و ئینجا ڕودۆلف کارناپ لەو باوەڕەدا بوون کە ئەو ڕستانەی باسی جیهانی دەوروبەر دەکەن تەنیا توێکڵن و پووچ و بێ واتان، ناکردنی ئەم ڕستانە یاخود پشتڕاستکردنەوەیان هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێ چونکە وەك ئەو تێزانەی باسی ڕەها (موتڵەق) و «شت لە خۆیدا» دەکەن چەند ڕستە و تێزەیەکی میتافیزیکن و بێ مانان، پێوانەیەکی دڵنیایی لێ کراو لەبەردەستدانییە بتوانێ ساغی بکاتەوە ئایا جیهانێکی دەرەوەی ئێمە و سەربەخۆ لەو کەسەی دەرکی پێ دەبات هەیە و هەبووە. ئەو ڕستەیەی بڕیاری بوونی دەوروبەر ئەدات وەك ئەوەی بوونەکە نا ئەکات بێ مانایە! ڕابەرانی



فەلسەفەی ئیدیالیزمی ئەڵمان فیختە، شیلنگ و هیگڵ لەلای خۆیانەوە بۆچوونەکانی کانتیان بەلاوە پەسندنەبوو، فەلسەفەیان بەلایەکی تردا بردوە، زۆر لە ڕێبازی شیکاریی و زانین دوورکەوتەوە و سروشتێکی تری پێ بڕاوە. بەڵام ئەم فەلسەفانە نەیانتوانی خۆیان لەبەردەم لێشاوی داهێنانە زانستییەکان و هێرشی فەلسەفەی مەتریالیستی سەدەی نۆزدەهەم بگرن. لەم دیاردەیەوە جۆرە بڕوا بەیەکتری نەبوون لەنێوان فەیلەسووف و زاناکان دەرکەوتووە. زاناکان بە چاوێك تەماشای فەلسەفەیان دەکرد کە وەك بریتی بێ لە مێژووی چەند کێشە و بابەتێك کە نەسوود بەخشن و نە دەکرێ بە ئامرازەکانی فەلسەفە بەلایەکدا بخرێن و وەڵامی پرسیارەکانیان بدرێتەوە. ئەو وەڵام و چارەسەرانەی فەیلەسوفەکان داویانەتە دەست لە ناوەڕۆك و ڕوخساردا گیانی زانستییانەیان تیادا نابینرێ و ئەو سود و بایەخەیان نییە ئەگەر لەگەڵ ئەوکات و مێشك و خامانە بەراورد بکرێن کە پێیانەوە خەریك بوون. فەیلەسوفەکان لەلای خۆیانەوە زۆر بەتەنگ بڕیار و بۆچوونی زاناکانەوە نەبوون بەو بیانووەوە گوایە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زانستی هەندەکی و تایبەتییەو ناگاتە ڕادەی فرەرەنگیی و سەرتاپاگیریی ئەنجامەکانی توێژینەوەی فەلسەفە. ئەم ناخۆشی و ڕقەبەریە زۆری نەخایاندوە و هەردوولا لە یەکتری خۆش بوون و پەیوەندی ئاسایی بۆ نێو هەردوو لایان، لەبەر چەند هۆیەك، گەڕاوەتەوە:

یەکەم- زانست ناتوانێ دەستبەرداری ئەو ئامراز و پەیڕەوانە ببێ کە فەلسەفە گەڵاڵەیان دەکات. زاناکان خۆیان دانیان پیادا ناوە کە چەندە لە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەدا قوڵ ببنەوە ئەوەندە گریمانە و ئەنجامەکانیان خەسڵەت و ڕەنگ و ڕوخسار و سروشتی هەمەکی و گشتییان پێ دەبڕێ. لێرەوە زانست دەگاتە سەر سنور و فەلسەفە دەست پێ دەکات. کەوابوو هەردووك لا پێویستیان بە یەکتری هەیە و ناتوانن دەستبەرداری یەکتری بن.





دووەم- فەیلەسوفەکان لە کەلی شەیتان هاتونەخوارێ، جارێکی تر بەوردی چاویان بە ئەرك و بابەت و لقەکانی فەلسەفەدا خشاندۆتەوە. زاناکان لەلای خۆیانەوە، بەرامبەر بەم هەڵوێستەی فەیلەسوفەکان، دایاننواندوە دانیان پیادا ناوە کە فەلسەفە ناکرێ لە بۆتەی زانستدا بتوێتە و دەبێ بوونی خۆی وەك راستییەك پشتڕاست بکاتەوە چونکە بابەت ومیتۆدەی تایبەتی خۆی هەیە بە تەواوەتی لەهی زانست جیاوازن.

سێیەم- زانستەکان خۆیان لە تەنگژە و قەیران و کێشە و بەرە بەدەرنەبوون. لە ماتماتیکدا کێشەی بنچینەکان دەرکەوتوە، ئەندازەی ئۆیکلیدس پەکی خراوە و چەند ئەندازەیەکی نا ئۆیکلیدسی دانراون. فرێگە ساغی کردۆتەوە کە بۆچوون و بەڵگەنەویستەکانی ماتماتیك سروشتێکی مەنتیقییان هەیە، توانیویەتی چەند پێشەکییەکی مەنتیقی بکات بە بنچینەی پەیدابوونی ژمێرە (ئاریتمێتیك). چەمك و هاوکێشە بنچینەییەکانی بیرکاری لە چەند قانونێکی سەرەکی بیرەوە کەوتونەتەوە. ماتماتیك لەسەر داروپەردوی مەنتیق سەری هەڵداوە، بیرکاری بەشێکی گرنگی ئەو زانستەیە کە پشت بە مەنتیق دەبەستێ، مەنتیقیش پوختە و جەوهەری فەلسەفەیە.

٤- لە زانستدا هەردوو تیۆری کوانتەم و رێژەیی وەك رەشەبا و گەردەلول داروپەردوو چەپەری چەمکە جۆربەجۆرە کلاسیکییەکانی زانستیان راماڵ کردوە و بنچینەکەیان هەژاندوە. لەکاتێکدا فەیلەسوفەکان سەرگەرمی پڕکردنەوەی ئەو کەلەبەرانە بوون کەوتبونە نێو کۆشکی فەلسەفەوە وەك ئەنجامێك کە لە ئاشتبەتاڵی فەلسەفەی ئایدیالیستی هیگڵ و لایەنگیرانی کەوتبۆوە. ماکس پلانك ساڵی ١٨٩٩ لە زانکۆی بەرلین (پایتەختی ئەڵمانیا) لێکۆڵینەوەیەکی پێشکەش کردوە کە بووە بە مایەی هەژاندنی ئەو بنچینەیەی زانستی فیزیك بە بنەمایەکی ساغ و پتەوی دادەناوە و پشتی پێ بەستووە.



پلانك لە لێکۆڵینەوەکەیدا پەردەی لەسەر تەنگژە و قەیرانی فیزیك هەڵداوەتەوە، بە پێچەوانەی بیروبۆچوونی زانایانی سەردەمی خۆی رایگەیاندووە کە ماددە و تیشك پژان لەسەر شێوەی چەند یەکەیەك کە ئەو بە کوانتای ناوبردووە، پێکهاتەیەکی بەیەکەوە نەبەستراو و پچڕاویان. هەیە پلانك وتویەتی، لە ساڵی ١٨٩٥ بەدواوە سەرگەرمی چەند بابەتێك بووە و هەوڵی داوە، وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، بۆچی، لەکاتی گەرمکردنی لەشێکدا رەنگی گڕی ئاگر دەگۆڕدرێ و وەك خۆی نامێنێ. ساڵی ١٨٩٩ توانی ئەو هاوکێشەیە دابڕێژێ کە بە نەگۆڕاوی پلانك ناسراوە(٥):

ه= ٦,٥٥×١٠ ^-٢٧^ یاخود $H= 6.55 \times 10^{-27}$.

دوای ئەم دۆزینەوەیە بنەمای بەردەوامیی و نەپساویی و ناچارەکیی کە لە میکانیکی نیوتن و ئەلیکترۆ دینامیکی ماکسویلدا باوبوون، پاشەکشەیان کردو و مەیدانیان چۆڵ کرد.

پلانك وای داناوە وزەی تیشك پژێن لەسەر شێوەی چەند یەکە و چەپکێکی پچڕاوی بەیەکەوە نەبەستراو پەیدادەبێ و دەکەوێتەوە و دەپژێ. لەسەر ئەم بنەمایە پلانك رەنگی بۆچوونێکی رشت بریتییە لەوەی کە وزە لە چەند کۆیەکی لە یەکتری دابڕاو نەك لە شەپۆل و تەزویەکی بەیەکەوە بەستراوی نەپچڕاو، پێك هاتووە، هایزنبێرگ چەند ساڵێك دواتر ساغی کردەوە کە ناکرێ رەوتی ئەتۆم پێشبینی بکرێت و پشت ئەستور بە دۆزینەوەکانی ماکس بۆرن ساغ بۆوە کە لە جیهانی بچوکی لابۆردا (میکرۆکۆزمۆس) لێکدانەوەی هۆیەکی (هۆ و ئەنجام) کارناکات و لە برِکەوتوە دەبێ لەمەولا پشت بە لێکدانەوەی ستاتستی – رێتێچونەکی ببەسترێ. واتە رووداوی ئەتۆمی بەقانونی هۆیەکی دەستنیشان ناکرێت بەڵکو پابەندی قانونی رێتێچونە. بەم پێیە زانستی فیزیك لە بنەڕەتدا هاتە هەژان و وەك فەلسەفە ناچار بوو جارێکی تر سەرلەبەر، چاو بە پێکهاتە و چەمك و بنەڕەتەکانیدا بخشێنێتەوە.





لەم کەشوهەوایەدا ڕێبازی کۆڕی ڤیەننا پەیدابووە ڕەنگی سیستەمە فەلسەفییەکەی ڕشتوە، ئەو سیستەمەی سروشتێکی مۆدێرن و پێشکەوتووی جیهان بینی هەبووە.

فەلسەفەی ئەزموونی مەنتیقی کۆڕی ڤیەننا و هەڵوێستی بەرامبەر بە فەلسەفەی پێش خۆی و کلاسیکی بەگشتی درێژەپێدان و گەشە پێکردنی گرنگترینی ڕێبازە ئەزموونییەکانی فەلسەفەیە، درێژەپێدانە بەو مانایەی پشتبەستن بە چەند ئامراز و ڕێگایەك بۆ بەدەستهێنانی زانین و پەرەپێدانی بنچینەکانی. کۆڕی ڤیەننا ڕاستی و دروستی زانستی لەوەدا دیتوە، تا چ ڕادەیەك و چەند توانای پێشبینی کردنی پاشەڕۆژی هەیە. چۆن دەکرێ جارێکی تر تەلاری مەنتیق ئاوەدان بکرێتەوە نەك بەوەی ئەزموون و شارەزایی بکرێن بەبنچینە و بنەمای دامەزراندنەوەکەی هەر وەك چۆن ستیوارت مل ویستویەتی، بەڵکو بەوەی کە توندوتۆڵ بە ماتماتیك و وێنەکانی بیرەوە گرێ بدرێت. مەنتیق و ماتماتیك توندوتۆڵ بەیەکەوە بەستراون و هیچ پەیوەندییەکیان بە ئەزموون و تاقیکردنەوەوە نییە.

ڕەتکردنەوەی میتافیزیکی کلاسیکی بەوە پشتڕاست دەکرێتەوە کە بەهۆی سەرنجدان و ڕامان و بیرکردنەوەوە و بەبێ پشتبەستن بە ئامراز و ڕێگا ئەزموونییەکان لە توانادا نییە مرۆڤ بگاتە ڕاستی و هەقیقەت.

بەباوەڕی من هەڵوێستی کۆڕی ڤیەننا سەبارەت بە میتافیزیك ڕەواییەکی تیادایە بەڵام ئەو ڕەخنەیەی لە میتافیزیك گرتویەتی ئەگەر کێشەیەکی چارەسەرکردبێ چەندین کێشەی تری لێ کەوتوونەتەوە. چونکە مرۆڤ لەبەرهەمەکانی ڕابەرانی ئەم کۆڕەدا پێناسەیەکی ڕێکوپێك و دیار و پڕ بەپێستی میتافیزیك نابینێ. میتافیزیك بەگشتی چی بووە لەلایان و بەچییان زانیوە و چۆن لە میتافیزیك گەیشتون؟ ئەم پرسیارە بەتەواوەتی و پشت ئەستور بە بەرهەمەکانیان وەڵام نادرێتەوە. زۆر بیروبۆچوونی فەلسەفە لە ریزی بابەتەکانی میتافیزیك دانراوە و لە لیستەی فەلسەفەی بەناو زانستیدا کوژێنراوەتەوە.



بیروبۆچوونی ئەم ڕێبازە دەربارەی فەلسەفە لەو ڕەخنەیەدا بەدەردەکەوێ کە لە ڕێباز و فەلسەفەی کلاسیکی گرتوویەتی. فەلسەفە چالاکییەکی بیرییە کێشە و بابەتەکانی فەلسەفە و زانست شی و ڕوون ئەکاتەوە. فەلسەفە وەك ئەم ئەرك و چالاکییەی پێ‌ی سپێردراوە وەك؛ دانانی سیستەمی فرە ڕەنگیی و سەرتاپاگیرانەی وەك هی هیگڵ و... هتد و پشت ڕاستکردنەوەی بۆچوونی دیاریکراو هیچی تر بە ئەرکی سەرشانی خۆی دانانێ، چونکە فەلسەفە خۆی وەك چالاکی دادەنێ نەك وەك بڕوا و دۆگما. ئەم دەستنیشانکردنەی ڕۆڵی فەلسەفە جۆرە بێ پێزکردنێکی بابەتەکەی لێ دەکەوێتەوە و هیچ ناخاتە سەر خەرمانی زانینی زانستییانە لەوە بەولاوە کە بنچینە و پێکهاتە و چەمك و بۆچوونە بنەڕەتیەکانی زانست شی ئەکاتەوە. فەلسەفە، بەپێ‌ی ئەم بۆچوونە، دەبێ زانستییانە بێت. فەلسەفەی زانستییانە وەك ڕودۆلف کارناپ ڕوونی کردۆتەوە دوو لایەنی هەیە:-

یەکەم- لایەنێکی نالەباری هەڵوەشێنەر. ڕەخنەکردنی جۆر و چەشنی بیرکردنەوەی میتافیزیکی کە لەگەڵ پێودانگی فەلسەفەی زانستیدا ناکۆکە و ناگونجێ.

دووەم- لایەنێکی لەباری بونیات نەر. ڕوونکردنەوەی ڕستە و چەمکە پڕ مانا و سوودبەخشەکان، دانانی بنەمای مەنتیقی زانستە ڕیالیستییەکان و ماتماتیك[٦].

لێرەدا هەمان پرسیار دێتەگۆڕێ، کەوابوو چی بۆ فەلسەفە بەمانا گشتییەکەی دەمێنێتەوە؟ بەپێ‌ی بۆچوونی کارناپ لەو لێکۆڵینەوەیەیدا کە لە پەراوێزدا نووسیومانە، ئەو ڕستە و تێزانەی پڕ مانایی و ڕاستییان ساغ دەبێتەوە دەچنە سەر خەرمانی بابەتی زانستییە ئەزموونییەکان و دەبن بە موڵکی زانستە ڕیالیستییەکان. کەوابوو نە ڕستە و نە تیۆریی و نە سیستەم پەیوەندییان بە فەلسەفەوە نامێنێ، چونکە فەلسەفە چالاکییە، پەیڕەوێکی دیاریکراوی سنور ڕەنگ بۆ ڕێژراوە و شیکردنەوەی مەنتیقییانە! کە ئامرازێکە بۆ پووچەڵکردن و





دورخستنەوەی بیر و ڕستە و بۆچوونی بێ مانا و زڕە تێزە لە مەیانی بیری زانستیدا بەکار دەهێنرێ.

ئەگەر ئەم پێودانگەی کارناپ و کۆڕی ڤیەننا پەسند بکرێت ئەوا دەبێ ئەو سیستەمە ڕەنگین و سەرتاپاگیرە فەلسەفییەی فیختە و شیلینگ و هیگڵ و هایدیگەر ڕاست و چەپیان بەسەردا بێت و وەك میتافیزیك و ڕستە و تێزەی بێ مانا لە مەیدان دور بخرێنەوە! هەردوو پرسیار، لەگەڵ ئەمەدا، هەر بە گەرموگوڕیی دەمێننەوە و چاوەڕێی وەڵام دەکەن:

یەکەم- ئایا میتافیزیك لە چەند بابەتێکی بێ مانا پێك هاتووە یاخود مافی بوون و بایەخ پێدانی هەیە.

دووەم- دەکرێ میتافیزیك لەسەر بنچینەیەکی زانست دابڕێژرێ؟

ئایا مێژووی فەلسەفەی کلاسیکی تا ئەوکاتەی کۆڕی ڤیەننا پەیدابووە مێژووی هەڵەی کەسانێك بووە، پرسیاریان کردووە و نەیانتوانیوە وەڵامی پرسیارەکانیان بدەنەوە؟ ئایا ئەو کەسانە شارەزاییان لە سێنتاکسی ئەو زمانە نەبووە کە بەکاریان هێناوە؟

٥- ئەگەر سەرنجێك لەو بابەتانە بدرێت کە لە ئۆرگانی کۆڕەکەدا — گۆڤاری زانین — لە ساڵی ١٩٣٠ تا ساڵی ١٩٣٨ بلاۆکراونەتەوە مرۆڤ بۆی دەردەکەوێ کە ڕابەرانی ئەم ڕێبازەی فەلسەفە کێشە و بابەت و پرسیارەکانی فەلسەفەی کلاسیکیان کردووە بە سێ بەشی لە یەکتری جیاوازەوە:

یەکەم- چەند کێشە و پرسیار و ڕستەیەك پەیوەندییان بە جیهانی ڕاستەقینەی دەوروبەر و ڕاستییەکانی شارەزایی و تاقیکردنەوەوە هەیە، ئەم پرسیارانە دەکرێ بەپێی بابەت لەلایەن زانستە جیاجیاکانەوە وەڵام بدرێنەوە.



دووەم- چەند پرسیار و کێشەیەك کە لەسەر شێوەی گرێیەك چەندین بابەتیان تیادایە دەکرێ بەهۆی شیکردنەوەی مەنتیقیی زمان ئیتر چمك و ڕستەکانی بێ، ئەو گرێیە بکرێتەوە و وەڵام پێشکەش بکرێت.

سێیەم- چەند بابەت و پرسیارێکی میتافیزیکییانە، ئەمانە زڕە پرسیار و زڕە کێشە و بابەتن ناکرێ وەڵام بدرێنەوە، چونکە ئەو زڕە کێشانەی تیایاندا هاتوون لە ئەنجامی بەهەڵە تێگەیشتنی مەنتیقی زمانەوە کەوتوونەتەوە و بێ ناوەرۆکی ڕاستەقینە و پووچ و بێ مانان[٧]. بڕیار و حوکمدان بەبێ مانایی و پووچی کێشەکانی میتافیزیك لەوەوە هاتووە کە بابەتەکانی بێ واتان. ڕستەکانی میتافیزیك مەرجی پێویستیی مەنتیقی، ئەو مەرجانەی واتا و مانا بەڕستە دەبەخشن تیایاندا پەیڕەو ڕەچاونەکراون. کێشەکانی میتافیزیك پەسند ناکرێن چونکە شیاوەکی نین و لە بنەڕەتدا بەهیچ پێودانگێك سوڕ و پشتڕاست و ساغ ناکرێنەوە. بنەمای ساغکردنەوە، وەك پێودانگێك لەسەرەتادا لەلایەن موریتس شلیکەوە پێشنیاز کراوە.

بنەمای ساغکردنەوە لەسەرەتادا پشتی بەواتای ڕستەکە خۆی دەبەست: (مانای ڕستەیەك لە ڕستەکان بنەما و پەیڕەوی ساغکردنەوەیەتی). لە دواییدا گۆڕانی سەرتاپاگیرانەی بەسەردا هات و دەستکاری کرا. کارناپ لەلای خۆیەوە دووپاتی کردۆتەوە، پێویستە پەنا ببردرێتە بەر شیکردنەوەی مەنتیقیی زمان و ڕستە و بۆچوون و تێزەکانی زانستی ئەزموونی. ئەم پەیڕەوە وەك پێودانگێك ڕێی قەلاَچۆکردنی میتافیزیك خۆش دەکات.

هەروەك لە لای فەیلەسوفەکانی سەدەی بیستەم، ئەوانی سەرگەرمی زانست و پەیڕەوی زانستی ئەزموونین، باوە، قانونە زانستییەکان (سروشتییەکان) بۆ لێکدانەوەی ڕەوش، ڕووداو و کەوتنەوەی قەوما و شتەکان، بەشێوەیەکی گشتی





دارێژراون. ئەم قانونانە وەك چەند بنەمایەك لە تاقیکردنەوە و ئەزموون و سەرنجدان و تێبینیکردن دەکەونەوە. واتە پشت بە بنەمای ئیندەکشن دەبەستن و لایەن و رەگەزێکیان تیادایە دەستەبەری پێشبینیکردنی لەمەو دوا دەکەن، هەروەها سروشتی رێ تێچونیان هەیە بەو مانایە کە قانونەکە راستە و برِ دەکات و کاری پێ دەکرێ تا ئەوکاتەی شتێك دەردەکەوێ پەکی قانونەکە دەخات یان ساغی دەکاتەوە قانونەکە راستی تیادا نییە و هیچی تر برِ ناکات. هەتا ئەو کاتەی شتێکی نوێ ناراستی قانونەکە دەردەخات، قانونەکە راستە ئیتر لەوە بەدواوە دەبێ جارێکی تر چاو بە قانونەکە دابخشێنرێتەوە و بە جۆرێکی تر دابرِێژرێتەوە کە لەگەڵ پێداویستی شتە تازە و رەوشە نوێیەکەدا تەبا و گونجاو بێ و ناکۆکییەکان بخاتە لاوە. ئەمەیە مەبەست لەو قسەیەی ئەزموونی مەنتیقی دەیکات و دەڵێ: کێشەکانی زانست، بە پرۆپۆزیشن و پرسیار و گریمانە و تێزەکانیەوە کێشەی گۆڕاو و پساوەن واتە هەمیشە لە پێشکەوتن و گۆڕان و مشتومالکردندا تاقیکردنەوەی نوێ پشترِاستیان دەکاتەوە یاخود زاناکان ناچار ئەکات جارێکی تر چاویان پێدابخشێننەوە. بەپێچەوانەوە پرسیار و بابەت و کێشەکانی فەلسەفە هەر لە سەردەمی یۆنانی کۆنەوە، کە لەوێ فەلسەفە پەیدابووە، تا ئەمرِۆ، پرسیارەکان و بابەتەکان وەك خۆیان بە نەگۆڕاویی ماونەتەوە. خۆ ئەگەر شتێکی لێ گۆڕا بێ ئەوا روخساری پرسیارەکان گۆڕاون یاخود بەجۆرێکی تر دارِێژراونەتەوە. زانست لە گۆڕانی نەپساوەو بەردەوام دایە، پرسیارەکانی فەلسەفە نەگۆڕاو و هەمیشە وەك خۆیان دەمێننەوە.

ئەگەر کۆڕی ڤیەننا بەگشتی و کارناپ بەتایبەتی بیانەوێ میتافیزیك دوور بخەنەوە و بابەتەکانی زانست بژار و مشتومالٚ بکەن بۆ ئەوەی تەپ و تۆزی میتافیزیکیان لێ بتەکێنرێ، چۆن مرۆڤ و بە چ رێگایەك دەتوانێ بابەت و کێشەکانی میتافیزیك لە هی زانست جیابکاتەوە؟! ئایا ئەم کۆڕە و کارناپ توانیویانە بەڵێنەکەی خۆیان



بگەیەننە سەر کاتێك برِیاریانداوە پەیرِەوە دژ بە میتافیزیکییەکەی ئێرنست ماخ بگرنەبەر؟!

زانستی تیۆری ئەو ئەرکەی کەوتۆتە ئەستۆ تابلۆئاسا وێنەیەکی رێکوپێکی سروشت بداتە دەست. کەرەسەی ئەو وێنەیە ئەو فاکتانەیە زانست لە سروشتدا بەدوایاندا دەگەرِێ، لەگەڵ یەکتریدا بەراوردیان دەکات، بژار و مشتومالٚ ئینجا رێکوپێك و پێکەوە دەیانگونجێنێ. راستە پەیرِەو و رێباز و بابەتی فەلسەفە لە زانست جیایە. بەلاٚم کە هەوڵ ئەدرێ فەلسەفە ببێ بە فەلسەفەیەکی زانستییانە مەبەست لەوەیە لە پاشماوەی بیروبۆچوونی میتافیزیك بژار بکرێت، جۆرە ستاندارتێکی بابەتیی و ژیرەکییانە (ئەقلانی) لەو بەڵگە و بەڵگەهێناوە و ساغکردنەوەیەدا پیادە بکات کە بۆ پاکانەکردنی بیروبۆچوونەکانی پەنایان دەباتە بەر. ئەم لایەنە لەو بابەتەدا، کە لە فەلسەفەدا بە میتافیزیك ناودەبرێ، پشتگوێ خراوە.

بۆ پاکتاوکردنی میتافیزیك لە بواری فەلسەفە و زانستدا کۆڕی ڤیەننا پەنای بردۆتە بەر دوو پەیرِەو یەکێکیان ئەوەیە کە پرۆفیسۆر مۆریتس شلیك پێشنیازی کردبوو بە ناوی بنەمای ساغکردنەوەوە، مانای رِستەیەك لە رِستەکان پێوانەی ساغکردنەوەی خۆیەتی. دووەم ئەو پەیرِەوەیە کە رودۆلف کارناپ لە باسێکدا لە ژمارە دووی گۆڤاری (زانین)دا لەژێر ناونیشانی «قەلاٚچۆکردنی میتافیزیك بەهۆی شیکردنەوەی مەنتیقییانەی زمان» بلاٚوکراوەتەوە، پێشنیازی کردووە.

پشت ئەستور بەلایپنیتس و دێڤید هیوم بە لای کۆڕی ڤیەنناوە دوو جۆر راستیی هەیە، راستیی ئەزموونی و راستیی بیرکاریی. ئەم دابەشکردنە لە دابەشکردنی زانستەکانەوە کەوتۆتەوە، زانستی شارەزایی و ئەزموون، زانستی فۆرم و روخسارەکی. بەشی یەکەمیان فیزیك دەگرێتەوە، ئەوی تریان مەبەست لە بیرکاریی





(ماتماتیك بە هەموو شێوەكانیەوە) لەگەڵ مەنتیقدا. كێشە و ڕستەكانی جۆری دووەم كە ڕوخسارەكین، پێكهاتەی ناوەكی خۆیان یاخود شێوە و جۆری ڕێكخستن و بەكارهێنانی هیماكانیان و پەیوەندییان بە یەكترییەوەو ئینجا بە جۆری داڕشتن تیایاندا ڕاستی و دروستییان دەردەخات. هەروەها سەرەڕای ئەم لایەنە، ئەم كێشە و ڕستانە جۆرە بڕیارێكن هیچ ناوەڕۆكێكی ئەزموونییان تیادا نییە و نابنە مایەی پتركردن و بە پێزبوونی زانین، بۆیە ئەگەر ناكۆكی ناوەكییان تیادا نەبێ هەمیشە ڕاستن.

كێشە و بابەت و ڕستەكانی زانستە ریالیستییەكان (بەشی یەكەم) چەند بڕیار و كێشەیەكن پەیوەندییان بە جیهانی دەرەوە، بەجیهانی دەوروبەرەوە هەیە، ماناو ناوەڕۆكی دیاریكراویان هەیە. ئەم ڕستانە (جووت بەهان) واتە دوو بەهایان هەیە، ڕاستن یاخود درۆن. بۆ ساغكردنەوەی ڕاستییەكەی پشت بە واتا ئەزموونییەكەی دەبەسترێ، واتە تا چەند ئەم ڕستانە بەهۆی دەستنیشانكردنی پەیوەندییە مەنتیقییەكانیوە بەكۆیەكی دیاریكراوی ئەو بابەت و كێشانەی بەهۆی تێبینی كردنەوە داڕێژراون و لەو كەوتونەتەوە، توانای تاقیكردنەوەیان هەیە و خۆیان لەبەریدا ڕادەگرن. گومان لەوەدا نییە ڕستە و پرۆپۆزیشنە زانستییەكان پەیوەندییان بە ڕووداو و فاكتەكانی جیهانی دەوروبەرەوە هەیە[8]. كەوابوو ڕستەیەك یان بڕیارێك ڕاست دەبێ ئەگەر ماناكەی لەگەڵ ڕێگای ساغكردنەوەی تەبا و كۆك بێت، چونكە كێشە یاخود ڕستە لەكۆیەكی شارەزایی و تاقیكردنەوە كە بە هەموویان بەتێكڕایی هاوكێشە و بەرامبەر بەوەن كە كێشەكە كێشەیەكی ڕاستە، بەولاوە نییە. بەڵام، وەك زانراوە، دەبێ تیۆری زانستی تاقیبكرێتەوە و بخرێتە ژێر نەشتەری توێ توێ كردن. تیۆریی لەخۆیدا كۆیەكی كێشە و پرۆپۆزیشن و ڕستەیە و ساغكردنەوەی ڕستەیەك، بەهۆی چەند ڕستە و پرۆپۆزیشنێكی ترەوە دەبێ، چونكە تاقیكردنەوە و تێبینی هیچ پەیوەندییان بە ڕستەوە نییە یاخود شتێك نین لە ڕستە، بەڵكو چالاكی و كرداری زەینی و ڕەفتاری تایبەتی ناخی



دەرونن. ئەم رەخنەیە هەنگاوێكە كە بەرەو چوونە ناو جیهانی زانین و شیكردنەوەی مەنتیقی دەهاوێژدرێ. بەواتایەكی تر، پشت ئەستور بە دابەشكردنەكەی پێشو، زانین بەگشتی، زانینی مرۆڤ لە دوو جۆر و بابەت پێك هاتووە:

یەكەم- زانینێك پەیوەندی بە واقیعەوە، بە جیهانی دەوروبەرەوە بە جیهانی نا (من)ەوە هەیە، ئەمەش بابەت و كێشەی زانستە ئەزموونییەكانی لێ پێك دێت.

ڕودۆلف كارناپ لە كتێبی «بنیاتنانی مەنتیقییانەی جیهان»دا بە ڕێكوپێكی و تێر و تەسەلیی ئەم بابەتەی باس كردوە، لەوێدا بەشێوەیەكی زانستییانە زمان و تاقیكردنەوەی خستۆتە دوو تای تەرازوویەكەوە و توندو تۆڵ بەیەكەوە گرێی داون و هەوڵی داوە، شیكردنەوەی مەنتیقی وەك كارناپ بە تایبەتی بەكاری هێناوە، ئامرازێك بووە بۆ دوورخستنەوە و پاكتاوكردنی میتافیزیك بەپێچەوانەی كانتەوە كە هەوڵی داوە دەست لە میتافیزیكی كلاسیك هەڵبگرێ و میتافیزیكێكی نوێ لەسەر بنچینەی زانستییانە دابمەزرێنێ.

ڕابەرانی ڕێبازی ئەزموونی مەنتیقی دوای ئەوەی ڕستە و پرسیار و كێشە ئەكەن بەسێ بەشەوە (وەك لەمەوبەر باسمان كرد) پێ لەسەر ئەو بۆچوونە دادەگرن كە جۆرە ڕستە و كێشە و پرۆپۆزیشن هەیە كە دەربارەی بوونەوەر كە هەر لە مێشكی زانا و فەیلەسوفدا هەیە دەدوێن و پەیوەندییان بە دەوروبەر و بابەتەكانیەوە نییە، بەڵكو رەمز و هێمان و بە چەمك و داڕێژراوی مێشكییان ناودەبەن، وەك ڕستەكانی مەنتیق و ماتماتیك و مێتازمانەكان (واتە ئەو زمانانەی بەتایبەتی دەربارەی زمانی ئاسایی دەدوێن). شیكردنەوەی مەنتیقی ساغی دەكاتەوە میتافیزیك ناكرێ لەسەر بنەمای زانست دابرێژرێ، بگرە ڕستە و كێشەكانی زڕن و بێ مانان و هیچ جۆرە واتایەكی مەنتیقی و ئەزموونیان لێ ناكەوێتەوە.

ئەم پەیڕەوە وەك كارناپ بەكاری هێناوە[٩] كێشە، پرۆپۆزیشن بەپێی فۆرم (روخسار) و ناوەرۆكەوە دەكات بەدوو بەشەوە، میتافیزیك رەت ناكاتەوە بەڵكو بەهۆی ئامرازی مەنتیق و ئەزموونەوە ساغی دەكاتەوە كە كێشە و بابەتەكانی میتافیزیك پووچ و بێ واتان. سەرەڕای ئەم لایەنە بۆ دانانی بناغەیەكی پتەوی زمان بۆ ئەوەی كۆشكی یەكگرتنی زانستی لەسەر دابمەزرێنرێ رێگا خۆش دەكات. بۆ ئەم مەبەستە كارناپ زمانی فیزیكی كردووە بەو بنەما پتەوەی كە وردیی و رێكوپێكی بیركاریی تیادایە و لە هەمان كاتدا باسی بابەتەكانی دەوروبەریش دەكات.

شیكردنەوەی مەنتیقییانە سەرگەرمی روونكردنەوەی مانا و پێناسەكردنی وشەیە بەلاّم بەپێچەوانەی رێزمانی زمانەوە، بایەخ بە چەمك و ئیدیۆم ئەدات بەتایبەتی ئەوانەی لە پرۆسەی زانیندا رۆڵی بەرچاویان هەیە. بۆ نموونە فەیلەسوفەكان هەندێ جار چەند وشەیەكی گشتییانە بەكاردەهێنن كە جۆرە تەمومژاوییەكیان پێوە دەبینرێ و وردەكاریان تیادا بەكارنەهاتوە و جاروبار دوو مانای لە یەكتری جیایان لێ بەدەردەكەوێ، لێرەوە شیكردنەوەی مەنتیقی وەك چارە رێگایەكی پێویست بەدەردەكەوێ بۆ پەردە هەڵماڵین لەسەر ئەم جۆرە زرە كێشانە كە لە ئەنجامی ناوردیی و تەمومژ و ئالۆزییەوە پەیدابوون. كارناپ لە چەند لێكۆڵینەوەیەكدا وشە و چەمك و ئیدیومەی نێو نووسینەكانی مارتن هایدیگەری شیكردۆتەوە. بۆ نموونە هایدیگەر وشەی (هیچ) بەبێ ئەوەی بەوردی ماناكەی دیاری بكات بەكارهێناوە، ئیتر لێرەوە زرە كێشەیەك دەكەوێتەوە. كارناپ ساغی كردۆتەوە كە لەبەرهەمەكانی هایدیگەردا وشەی (هیچ) بەدوو مانا و دوو مەبەست بەكارهاتوون بێ ئەوەی بەتەواوەتی خەمی بنەما مەنتیقییەكان خورابێ. بەڵگەكانی هایدیگەر لە زرە بەڵگە بەولاوە نین چونكە لەدوو جۆرە بەكارهێنانی وشەی (هیچ) پەیدابوون، جارێكیان وەك رستەی بوونێكی نا لێكراو (نێگەتیڤ) و جارێكی تر وەك بابەتی بوونەكی گوایە بوونی بابەتێك دەردەبڕێ. كارناپ وای بۆ چووە وشەی (هیچ) و



كرداری (هیچ كردن) كە لێی كەوتۆتەوە پووچەڵیی بەڵگەكان ساغ دەكەنەوە چونكە لە توانادا نییە و ناكرێ ئەم وشەیە لە زمانی سادەو ساكاری مەنتیق و مەنتیقی بارەكیدا بە رەوانی جێگای بكرێتەوە[١٠]. شیكردنەوەی مەنتیقی بەپێی ئەو نیاز و مەبەستەی فەیلەسوف هەیەتی، پەنادەباتە بەر ئەو ئامرازانەی لە مەنتیقی بیركاریدا باون، بەكاردێن. ئەگەر مەبەست و نیازەكە تیۆری زانین بوو جۆرێكە و ئەگەر نیازەكە مەنتیق بوو جۆرێكی ترە[١١].

ئەگەر نیازەكە زانین بوو پرۆسەكە پشتڕاست بە بەڵگەی تێبینیكردن ئەو وشە و ئیدیۆمە و پرۆپۆزیشنانەی واقیع و دەوروبەر دەردەبڕن جارێكی تر دادەڕێژرێنەوە. ئەوی پەیوەندی بەمەنتیقەوە هەیە چالاكی و كرداری پیادەكردنە كە پتر خۆی لە جۆرە فۆرمولەكردنێكدا دەبینێتەوە كە لەسەر بنەمای چەند سیستەمێك كە خۆیان بە چەند گریمانەیەكەوە بەندن و هەر لەوان دەكەونەوە، ئەنجام دەدرێ و وەردەگیرێ.

روونكردنەوەی واتا و پێناسەكردنی وشە و ئیدیۆمە لەم بارەدا وەك ئەوە وایە ئەو بنەمایانە دەستنیشان بكرێن كە كاتی بەكارهێنای وشە و ئیدیۆمە پشتیان پێ دەبەسترێ ئەمەش بێ گومان لە پێناسەی قاموسیی وشە جیاترە. شیكردنەوەی مەنتیقی چەند هەنگاوێكی تر بەرەو پێشەوە دەنێ بۆ گەڕاندنەوەی رستەكان بۆ سەریەكتری ئینجا كەمكردنەوەی ژمارەی ئەو وشە و چەمكانەی كە بەكارهاتوون تا دەگاتە چەند رستە و وشەیەكی سەرەتایی و بنچینەیی كە لە ئەوان بەولاوە مەودای شیكردنەوە نامێنێ. رستە ئالۆزەكانی زمان بەهەنگاوی رێكوپێك شی دەكرێنەوە و دەگەڕێنرێنەوە بۆ سەر سادە و ساكارترین شێوەی رستە كە راستەوخۆ واقیع و بابەتەكانی دەوروبەر دەردەبڕن و بگرە وێنەیەكی كۆپی كراوی واقیعن و دەكرێ لەبار، نالەبار حوكم و بڕیاریان لەبارەوە بدرێت. ئەم جۆرە رستانە لە گۆڤاری ناوەندی كۆڕی ڤیەننادا بە رستەی پرۆتۆكۆڵی ناوبراون. ئەمە ئەو پەیڕەوەیە كارناپ لە فەلسەفەكردندا گرتبوویە بەر و ناوی زانستی لێ ناوە. ئەم پەیڕەوە پشت بە





شیکردنەوەی مەنتیقی ڕستەکانی زمان و چەمك و پڕۆپۆزیشنەکانی زانستە ئەزموونییەکان دەبەستێ، هەروەها، لەلایەکی ترەوە، لە دووخاڵدا لە پەیڕەوە کلاسیکییەکانی فەلسەفە جیاوازترە[١٢].

یەکەم- ئەم جۆرە چالاکییەی فەلسەفە و فەلسەفەکردن شانبەشانی زانستی ئەزموونی پیادە دەکرێ. بەو مانایە کە مەیدان و بواری فەلسەفە هەر بە تەنیا زانین و تیۆری زانین نییە بەڵکو وەك ئامرازێکی مەنتیقیش خزمەتی سوود و قازانجی زانست و زاناکان ئەکات و بگرە مەنتیقی زانستە.

دووەم- پەیڕەوێکە بە ئاشکرا ئەو ڕۆڵە دەردەخات کە فەلسەفە لە بواری زانستە ئەزموونییەکاندا دەکرێ بیگێڕێ. ڕوونکردنەوەی ڕستە و چەمك و پڕۆپۆزیشنەکانی زانستە ئەزموونییەکان، شیکردنەوە و توێ توێ کردنی ئەو ڕستانەی لێیانەوە پێك هاتووە، واتە گێڕانەوەی بیر و چەمك و پڕۆپۆزیشنەکانی بۆ سەر ئەوانەی کە بنەڕەتی و جەوهەریی و سەرەتایین... مەنتیق پەیڕەوی فەلسەفەکردنە.

فەلسەفەی کۆڕی ڤیەننا و ڕێبازی ئەزموونی مەنتیقی کە لەوەوە پەیدابووە لە قۆناغێکدا سەریان هەڵداوە، بەجۆرە لە دایك بوونەوەیەکی نوێی زانست و زانستەکان ناسراوە، شۆڕشی کوانتەم و تیۆری ڕێژەیی ئاینشتاین. شۆڕشی کۆڕی ڤیەننا، پشت ئەستور بەو گۆڕانە زانستییە سەرتاپاگیرانە، لەبواری فەلسەفەدا بریتی بووە لە وەرچەرخاندن و گۆڕینی باری فەلسەفە لە دۆخ و بارێکەوە بۆ بارێکی تر. جاران فەیلەسوفەکان سەرگەرمی لێکدانەوەی دەوروبەربوون ئێستاکە بابەتی فەلسەفە کە دەبێ فەیلەسووف خۆی پێوە خەریك بکات شتێکی ترە؛ چوونە ناو قەدەغە و پاوانی زمان و پێکهاتە مەنتیقییەکانی! بۆیە شلیك وتویەتی، لەمەشدا کارناپ لەگەڵیدا بووە، فەلسەفە بەمانا کۆنەکەی نەماوە، ئێستاکە فەلسەفەکردن هەیە. میتۆدەو پەیڕەوی فەلسەفەش مەنتیقە. کێشەکانی فەلسەفە ئێستاکە



جۆرێکی ترن، کێشەی توێژینەوەی ئەو بنەماو بنچینانەیە کە زانست لەسەریان دادەمەزرێ.

سێیەم- ناکرێ و لە تواناشدا نییە بنچینەیەکی زانستیی بۆ میتافیزیك دابڕێژدرێ. دوورخستنەوەی میتافیزیك لەوەوە پەیدانەبووە چونکە کێشە و بابەت و بڕیارەکانی درۆن یاخود ڕاستن، بەڵکو لەوەوە کەوتۆتەوە کە کێشەکانی بەهەردوو شێوازە مەنتیقی و ئەزموونییەکەی پووچ و بێ مانان.

چوارەم- زانین و لێکدانەوەی جیهانی دەوروبەر بووە بە ئەرکی سەرشانی زانستە ئەزموونییەکان هەریەکە بەپێی بواری چالاکی و پسپۆڕێتی خۆی، فەلسەفە، وەك کۆڕی ڤیەننا دەڵێ، شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی مەنتیقییانەی کێشە و بابەتەکانی زمانی زانستی پێ دەسپێردرێ. لایەنگیری ئەزموونی مەنتیقی، کارناپ وتەنی، دەربارەی واقیعیەتی بوونی دەوروبەر، دەربارەی ڕاستیی و ناڕاستیی ناوەڕۆکی هەستەکان، دەربارەی ئەوەی ئایا جیهانی سروشتی دیاردەی ڕاستەقینەیەکی ترە یان نا، واتە دەربارەی گریمانە و تێزەکانی ڕیالیست و ئایدیالیستییەکان[١٣] هیچ بڕیار و حوکمێك نادات، چونکە ئەم تێزەو بڕیاردانە لەبارەیانەوە زڕە کێشەو زڕە بڕیارن، لە ئەنجامی نەزانینی مەنتیقی زمانەوە کەوتونەتەوە.

پێنجەم- مانای کێشەیەك لەوەدایە تا چەند دەکرێ ڕاستی و ناڕاستییەکەی ساغ بکرێتەوە. ساغ کردنەوەکەیان مەنتیقییانە یاخود ئەزموونی دەبێت و لەم دووانە بەدەر نییە.

شەشەم- زانست بەلای ئەزموونی مەنتیقییەوە دەکرێت بەدوو گروپەوە:

أ- زانستی ڕوخسارەکی وەك بیرکاری و مەنتیق. ناوەکەیان لەوەوە هاتووە بایەخ بە ڕوخسار و وێنەی پێکهاتەکان دەدەن بەبێ گوێدانە مانا و ناوەڕۆکی ئەم پێکهاتانە.

ب- زانستی ڕیالیستی وەك فیزیك... هتد. سەرگەرمی بابەت و پێکهاتەکانی دەوروبەرە. بۆیە ڕستە و پڕۆپۆزیشنە ڕاستەقینەکانیش دووجۆرن:





ا: ڕستەی شیکاری دووبارەکی ئەمانە تاوتۆلۆجین واتە شتێك دەڵێن کە لە دراوی ڕستەکاندا هاتووە و نابنە مایەی پتر و فراوانکردنی زانین و بەهیچ جۆرێك باسی واقیع ناکەن. ڕاستییەکەیان لە پێکهاتەی مەنتیقی ناوەکیانەوە دەکەوێتەوە.

ب: ڕستەی لێکدراوی پاشیانە، دەربارەی بابەتەکانی دەوروبەر دەدوێن دەکرێ پشت ئەستور بە شارەزایی (خیبرە) ڕاستی و ناراستیان سوربکرێتەوە.

حەوتەم- لە فەلسەفەی کۆڕی ڤیەننادا شتێك نییە پێی بوترێ (شت لە خۆیدا) بەو جۆرەی کانت وتویەتی. گوتن دەربارەی (شتێك لە خۆیدا) کە نەکرێ بزانرێ و ڕێی پێ ببردرێ قسەیەکی پووچ و بێ مانایە.

جیاکردنەوەی میتافیزیك لە فەلسەفە، مەنتیق بەهەردووك شێوەی ڕوخساری و پراکتیکییەوە بابەتی سەرەکی و پوختەی ناوەرۆکی فەلسەفەن، مەنتیقی پراکتیکی ناوێکی تری تیۆری زانینە.

دوورخستنەوەی میتافیزیك وەك بابەتێك لە قەدەغە و پاوانی فەلسەفە خاڵێکە لەو خالآنەی هەر لەسەرەتاوە بە ناوچاوانی ڕێبازی فەلسەفەی پۆزیتیڤیزمەوە دیاربووە. میتافیزیك و بڕوا و هەست و ئیمان خراونە نێو دوو تای تەرازوویەکەوە و هەموو جۆرە بەهایەکی ڕاستیی و ڕاستەقینەیی لێ زەوت کراوە. کارناپ هەر لە سەرەتای تەمەنی ئەکادیمیاییەوە دوژمنێکی سەرسەختی میتافیزیك بووە و لەو باوەڕەدابووە میتافیزیك کۆمەڵە زڕە ڕستەیەکی بێ مانان و گوایە دەربارەی زانینن. لایەنگرانی میتافیزیك سوورن لەسەر ڕەوایی بوون و بابەت و کەرەسەکانی میتافیزیك و وەك زادەیەکی گیان و ژیری مرۆڤ بەرامبەر بە زانست دایدەنێن. بەلای کارناپەوە ئەم قسەیەی ئەو میتافیزیکییانە لە دوو ڕوخساری بابەتەکانی میتافیزیکدا بەدەردەکەوێ:



یەکەم- لەنێو بابەتەکانی میتافیزیکدا تێزە و بۆچوون و بڕیار لەسەر شێوەی بابەتی فەلسەفەیی دەبینرێ وەك ئەوانەی باسی بوونی گیان و خوا (ڕەب) دەکەن.

دووەم- بابەتی تر کە لە هی زانستەکان دەچن بەلآم لە بەرگێکی فەلسەفەییدا بەتایبەتی ئەوانەی باسی جیهانی دەوروبەر و بابەتەکانی جیهانی نا (من) و بوونی هەمەکیەکان (کوللیات) دەکەن[١٤]. دیکارت لە میتافیزیکدا باسی بوونی گیان و ڕەب و نەفسی کردوە و هەوڵی داوە بوونی جیهانی دەرەوەی خۆی ساغ بکاتەوە. بەلای ئەفلاتونەوە بوونی هەمەکیەکان لە بوونی ڕاستەقینە کەمتر نییە. سەرەڕای فەلسەفەی لایبنیتس و ڤۆلف و کانت و هیگڵ کە هەریەکە لەلای خۆیەوە سیستەمێکی سەرتاپاگیری فەلسەفەی ڕەنگ ڕشتوە. ئەگەر کانت هەوڵی دابێ میتافیزیك ببێ بە زانست ئەوا بەلای زۆربەی هەرەزۆری فەیلەسوفەکانەوە میتافیزیك و زانست دوو بابەتی لە یەکتری جیاوازن و هیچ پێویست ناکات یەکێکیان وەك ئەوی تری لێ بێت.

لە مێژووی پڕ بەپیت و پێزی فەلسەفەدا ئەوەندەی بابەتەکە پەیوەندی بە تیۆری زانین و میتافیزیکەوە هەیە، دوو ڕێبازەکی سەرەکی بەدی ئەکرێت.

- ڕێبازی ریالیزم.

- ڕێبازی ئایدیالیزم.

ڕێبازی یەکەم، سەبارەت بە میتافیزیك، داکۆکی لەو بۆچوونە کردوە کە دەڵێ،

یەکەم- شت، لەش بوونەوەرەکانی دەوروپشتی من کە بەهەستەکان بوونیان دەزانرێ نەك هەر بەتەنیا ناوەرۆك و بابەتی هەست و هۆشیان لێ پێك دێت، بەڵکو بگرە لە خۆیاندا هەن و بوونیان هەیە.





دووەم- لەشی مرۆڤی تر جگە لەوەی وەك لەشی من کاردانەوە و کارتێکردن و چالاکییان هەیە، ئەوا مرۆڤی تر هۆشیان هەیە و هوشیارن.

تێزەکانی ڕێبازی دووەم، ئایدیالیزم بەپێچەوانەی یەکەمەوە خۆ دەکات بە سەرپشك و پێودانگێکی تایبەتی بۆ هەبوونی «بوون» دادەنێ.

یەکەم- جیهانی دەوروبەر راستەقینە نییە بەڵکو تەنیا هەستەکان و ناوەرۆك و پرۆسەی هەستپێکردن بە بوون و بۆچوونەکانم راستەقینەن.

دووەم- راستەقینە تەنیا بریتییە لە پرۆسە و رەوش و ناوەرۆکی هەست و هۆشی من. بوون ئەو بوونەیە بەشێوەیەك من هەست بەبوونی بکەم.

ئەگەر من نەبم چۆن بوونی نا (من) پشتڕاستدەکرێتەوە؟ کارناپ لەو باوەڕەدایە کە زانست ناتوانێ راستی و هەڵەیی ئەو جۆرە پرسیار و کێشانە ساغ بکاتەوە[١٥]. ئەم جۆرە پرسیارە فەلسەفییانە ناکرێ و لە توانادا نییە بە پێوانەی ئیمپری (ئەزموونی) بە ئا یاخود بە نا وەڵام بدرێنەوە، چونکە پرسیار و کێشە و بابەتەکان لەخۆیاندا پووچ و بێ مانان. ئاشکراشە کە مرۆڤ دەتوانی بزانێ ئایا ڕستەیەك پڕ مانایە یاخود بێ مانایە پێش ئەوەی بزانێ راستە یاخود هەڵەیە[١٦]. ئەو پرسیارەی لێرەدا بەبیردا دێت، ئایا ئەم کێشە گەورە و گرانانە کێشەی پووچ و بێ مانان و لە نەشارەزایی بنچینەکانی مەنتیقی زمان کەوتونەتەوە؟ تۆ بڵێی پرسیاری بەمانا و رێکوپێك دەربارەی کێشەی بوون بەگشتی و کێشەبوونی بابەتەکانی (نا — من) هەبێ یان نا؟ هەرچۆنێك بێت بوون (وجود) سروشت و خەسڵەت نییە بە بڕیارێك بدرێت بە بوونەوەر و دۆخەکەی بگۆڕدرێ و بەبڕیارێکی تر لێی زەوت بکرێت. ئینجا بوون لەخۆیدا پوختە و جەوهەرە. جەوهەر بەشی بنەڕەتی و سەرەکیی بوونی ئەو بوونەوەرەیە کە ئەمە رەوش و دۆخەکەیەتی وەك لە مەنتیقدا باوە.



هەمیشە کێشە و بابەتی میتافیزیك پەیوەندی بەهۆش و بیر و شارەزاییەوە هەیە. ئەگەر مرۆڤ بیەوێ لە میتافیزیك بپێچێتەوە ئەوا ئەبێ بیر و شارەزایی (خیبرە) توێ توێ بکات. شارەزایی و بیر بەهۆی ئامرازی زمانەوە دەردەبڕدرێن. وەك باوە توێ توێ کردنی بابەت و ناوەرۆکی بیر و هۆش لە رێگای توێ توێ کردنی مەنتیقی زمانەوە دەبێ. ئیتر لێرەوە وەڵامی پرسیارەکە درایەوە: ئایا دەکرێ بیر وەك شتێکی سەربەخۆ توێ توێ بکرێ؟ یاخود دەبێ ئەو ئامرازە شی بکرێتەوە کە چوارچێوە ئاسایی بیری تیادا داڕێژراوە؟

ئەم پرسیارە و وەڵامەکەی، شیکردنەوەی بیر و ڕستەکانی زمان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، فەلسەفەی بیرو فەلسەفەی زمان دەخاتە دووتای یەك تەرازووەوە، ئەنجامەکەشی: بەهۆی چالاکی و رۆڵی زمانەوە دەچێنە ناو جیهانی پان و بەرینی بیرو بابەت. ئەگەر بێتو شارەزایی تەواو لە مەنتیقی زمان هەبێ، ئەوا شارەزایی لە بیر و بابەتەکانی دەبێ و لەمەشەوە مرۆڤ راست و رەوان شارەزایی لەبارەی جیهان دەستگیردەکات و دەزانێ جیهان و دەوروبەر چییە. بیر بە خۆیی و وێنە جۆربەجۆریەکانیەوە وەك ئاوێنەیەك وێنەی جیهانیان تیادا دەنەخشێ و زمان راست و رەوان ئەو وێنەیە دەردەبڕێ. ئەم بۆچوونە بەهیچ جۆرێك لە نرخ و بایەخی بۆچوونەکەی کارناپ کەم ناکاتەوە کە وتوویەتی مرۆڤ (مەبەستی فەیلەسوفە) دەبێ زۆر بە سڵ و پارێز بێ کاتێك ڕستەکانی بابەتێکی فەلسەفە شی و توێ توێ دەکات، چونکە زۆرجار لە تیکستی فەلسەفەدا کۆمەڵە وشەیەك بەدوای یەکتریدا دێن و روخساری ڕستەیەکی ئاساییان پێوە دیارە و بە ڕستە دادەنرێن، کەچی ئەم کۆمەڵە وشانە ڕستە نین. کۆمەڵە وشەیەك کاتێك ڕستە نابن کە وشەیەکیان بێ مانابوو[١٧]، یاخود... تاکە وشەکان مانایان دەبێ بەڵام لەگەڵ پێکهاتە و چۆنیەتی ڕستەکەدا ناگونجێن، ئەمە ئەو سەرچاوەیە کە کێشە و زڕە ڕستەکانی میتافیزیك لێی دەکەونەوە.





من لاریم لەوە نییە، کە لەنێو جیهانی پان و بەرینی میتافیزیکدا (ئەم کێشە و زڕە رستانە!) دوور نییە هەبێت. بەلاّم ئەمە هەموو میتافیزیك نییە و سەرتاپای میتافیزیك ناگرێتەوە. ئەوی کارناپ مەبەستییەتی جۆرە بابەتێکی میتافیزیك دەگرێتەوە و فەلسەفە بەبێ میتافیزیك بەلای هەموو کەسێکەوە پەسند نییە.

میتافیزیك زادە و بەرهەمی بیرو بۆچوون و هەست و نەستی مرۆڤە. بەجۆرێك لە جۆرەکان هەلّوێستی هەمەڕەنگی ژیان و بۆچوون و هۆشی مرۆڤ دەردەبڕێ. هەتاوەکو مرۆڤ و ژیان مابن و میتافیزیکیش دەمێنێ. ئەم بۆچوونە لاری لەوە نییە کە میتافیزیك لەلای خۆیەوە وەك هەموو بابەتەکانی بیرو ژیری مرۆڤ لە قانونی گۆڕان و پەرەسەندن بەدەر نییە و گونجان لەگەلّ رەوش و سروشتی قۆناغ و سەردەمدا هەمیشە مەرجی بەردەوام بوون و مانەوە و ژیانە. ئەوی کارناپ و لایەنگرانی بە میتافیزیکیان داناوە بەشێکی کەمە، لقێکی بچووکە لە درەختە سیستەم ئاسا گەورەکەی میتافیزیك



## پەراوێزەکان

1- Schlick, Morits., Die Wende der Philosophie: In: Erkenntnis. Bd. I. Leipzig 1931. S. 4-11.

٢- کانت، رەخنەکردنی ژیری بێگەرد (بە ئەلّمانی) پێشەکی ب(٣٠).

(*) دوور نییە ئەو سنور بەزاندنە کە ژیر دەیکات، لە روانگەی زانستی ئاکارەوە، تارادەیەك کێشەی کلۆلّی و بەد بەختیشی لێ بکەوێتەوە.

٣- کانت، هەمان سەرچاوە (ئەلّمانی) ب٢٢.

4- Stegmueller, W., Hauptstroemungen… Bd. I. S. XXVII.

(**) بە باوەڕی من هیچ کاتێك ئەنجام کە لێرەدا میتافیزیکە لێ پرسینەوەی لەسەر نییە دەبێ هۆکار کەلێرەدا ژیرە، ئەگەر راست بێ میتافیزیکی داهێنابێ، دەبێ پرسینەوەی لەگەلّدا بکرێت. من وای بۆ دەچم کە میتافیزیك بە تەنیا بابەتی ژیر نییە، بەلّکو پوختە و جەوهەر و سروشتی بوونی مرۆڤ، بە ژیان و کرداریەوە، بەهەست و سۆز و ناخی دەروونییەوە ئۆبالّی پەیدابوونی میتافیزیکیان دەکەوێتە ئەستۆ. رەخنەکردنی میتافیزیك بەمەبەستی بە پیرۆزکردن و بەرەوپێش بردنی شتێکە و گازندەکردنی بە مەبەستی ئەوەی ببێ بەزانست پتر کەمکردنەوەیە لە سروشت و توانای مرۆڤ کە خۆی لەخۆیدا فرەڕەنگییە و هیچ جۆرە یەك رەنگییەك بەشێوەیەکی ئاسایی قبولّ ناکات. بوونی میتافیزیك بە بابەتە جیاوازەکانیەوە، بە سەرکەوتن و ساتمەکانیەوە بەشێکە لە بوونی مرۆڤ خۆی و ئەو پرۆسە نەسرەوتە ساغ دەکاتەوە کە ژیری مرۆڤ لەو رۆژەوە شانۆکەی ئادەم و حەوای بەسەردا بردراوە، بەخۆیەوە بینیویەتی.

5- Planck, Max., Vortraege and Erinnerungen. Darmstadt 1970. S. 24-26.

٦- کارناپ، پووچەلّکردنەوەی میتافیزیك (بە ئەلّمانی) ل ٢٣٧-٢٣٨.





7- Kraft, V., Der Wiener Kreis. Wien 1968. S. 175.

٨- ئەم بنەمایەی ساغکردنەوەیە هەر لەسەرەتاوە رەخنەکراوە و گۆڕانی سەرتاپاگیری بەسەردا هێنراوە. بۆ نموونە کارڵ پۆپەر بە تێر و تەسەلیی لە کتێبی *مەنتیقی لێکۆڵینەوەی زانستی*دا ئەم بنەمایەی توێ توێ کردوە و وای داناوە کە کەموکوڕیی تیادایە و پێشنیازی کردوە کە بە بنەمایەکی تر بگۆڕدرێ، بنەمای بەدرۆ خستنەوە و ئینجا بنەمای دەرچوون لە تاقیکردنەوەدا.

Popper, Karl., Logkder Forschung. Tuebingen 1976.

٩- کارناپ: پووچەڵکردنەوەی میتافیزیك (بە ئەڵمانی) ل. ٢١٩-٢٢٠.

١٠- کارناپ، هەمان سەرچاوەی پێشوو (بە ئەڵمانی) ل: ٢٣٠.

11- Waismann, F., Gesammelte Aufsaetze. Frankfurt-a m 1973 S. 65.

١٢- کارناپ: مەنتیقی کۆن و نوێ. لە کۆتایی ئەم کتێبەدا: (تێکستی هەڵبژاردە).

13- Carnap, R., Scheinprobleme in der Philosophie. Suhrkamp Verlag. 1966. S. 63-64.

14- Carnap, R., Logische Syntax der Sprache. Wien 1934. S. 205ff.

15- Carnap, R., Scheinprobleme…. S. 61.

١٦- کارناپ، هەمان سەرچاوە (بە ئەڵمانی) ل: ٤٧.

17- Carnap, R., Der Logische Aufbau der Welt. Hamburg 1974 S. 254 (P. 180).








## (٤)

# جیهانبینی لە بۆچوونی مەنتیقی نوێیەوە

١- گومان لەوەدا نییە فەلسەفەی ئەزموونی مەنتیقی کۆڕی ڤیەننا، لەگەڵ ئەنجامە بەپێزەکانی پەرەسەندنی مەنتیقی بیرکاریی (فرێگە، رەسڵ) لە سیستەمە سەرتاپاگیرە فەلسەفە پۆزیتیڤیستەکەی کارناپدا کە لە کتێبی (بنیاتنانی مەنتیقی جیهان ١٩٢٨ز)دا رەنگی رشتوە، بەشێوەیەکی داهێنەرانە ئاوێتە و داڕێژراون. لەو شاکارەدا کارناپ بڕوای تەواوەتی بەوە بووە، سیستەمی رێکوپێکی لە چەمك و بۆچوونەکان پێك هاتوو، بەشێوەیەکی هەمەکی — گشتی و بێ ناتەبایی و ناکۆکی ناوەکییانە زانینێکی زانستییانە دەربارەی جیهان دەداتە دەست. کارکتەر و خەسڵەتی سیستەم ئاسایی زانین بەسێ مەرجەوە بەندە، بەو شێوەیەی زانین لەخۆیدا، بڕوایەکی پشتڕاست کراوەیە:

یەکەم- تا چەند ئەو زانینە پشتی بە مەنتیق بەستوە.

دووەم- دانانی بەردی بناغە و بنەماکانی تا چەند پەیڕەوی مەرج و فاکتەرەکانی زانستیان تیادا کراوە.

سێیەم- تا چەند لە بنەڕەتدا پشتی بە پەیڕەو و رێبازی ئەزموونیی (ئیمپری) بەستووە.

ئەم سێ مەرجە هەرسێ جۆری زانین بەگشتی دەگرنەوە، ئەگەرچی ئەم سێ جۆرە لە خۆیاندا جۆرە سەربەخۆییەکیان هەیە و توندوتۆڵیش بەیەکەوە بەستراون.

یەکەم- زانینی زانستییانە.

دووەم- زانینی فەلسەفەیی.

سێیەم- زانینی سروشتی (ئاسایی).



ئەوی لێرەدا مەبەستە و پەیوەندی بە ناوەڕۆکی باسەکەوە هەیە هەردوو جۆری زانینی زانستی و فەلسەفیە کە توندوتۆڵ بەیەکەوە بەندن و دەرگای بە زانستیکردنی فەلسەفە واتە فەلسەفەی زانستییانە دەخەنە سەرپشت، ئەو دەرفەتەی کارناپ لەسەردەمی دەستبەکاربوونی لە کۆڕی ڤیەننادا سوود و کەڵکی لێ وەرگرتووە. کارناپ بە جۆرێك سەرنجی فەلسەفەی زانستی داوە کە بریتی نەبێ لە سیستەمێکی بە تەواوەتی ڕەنگ بۆ ڕێژراو(١) و تەواوبوو بەڵکو پرۆسەیەکە نەسرەوت هەمیشە لە پەرەسەندندایە. ئەو پرۆسەیە نەپساوەیەی پەرەسەندن بەدوو قۆناغدا تێدەپەڕێ:

یەکەم- بژارکردن و مشتومالکردنی چەمکی فەلسەفە بە ناوەڕۆك و روخسارەوە و تەکاندنی ئەو تۆزەی بەدرێژایی سەدەکانی رابوردو لێ نیشتوە وەك هەنگاوی سەرەکی دەستبەرداربوونی فەلسەفەیەك کە تەنیا پشت بە زەین روونیی و تێڕامان ببەستێ و وردبوونەوەی بێ بنەمای زانستییانە بکات بە ئامرازی چالاکییەکانی، بۆ دانانی بەردی بناغەی تیۆری زانین.

دووەم- لە قۆناغی دووەمدا کە دەکرێ بە هەنگاوی دووەم ناو ببردرێ پووچی بڕیاری لێکدراوی پێشیانە Synthetische Apriori ساغ دەکرێتەوە. ئینجا پشت ئەستور بەم چالاکییە ڕەنگی سیستەمێکی ئەزموونی تیۆریی زانین دەڕێژدرێ و لە دواییدا ئەم تیۆریە زانینە ئیمپریکییە رێگای بابەتێکی تر خۆش دەکات، بابەتی مەنتیقی زانینی زانستییانە کە بە قسەی کارناپ بۆ بەرەوپێشبردنی بیری فەلسەفە و خزمەتکردنی زانست و زاناکان و سوود وەرگرتن لە ئەنجامە سەرتاپاگیرەکانی چالاکی زاناکان کاریگەرترین ئامرازێکی دەستبەکاریی فەلسەفەی سەدەی بیستەمە.





تیۆری زانینی ئەو سەردەمە، وەك لقێکی سەرەکی فەلسەفە بریتی بووە لە ئاوێتە و تێکەڵ بوونێکی تەمومژاوی و سنور نادیاری بابەتی دەروونناسی(سایکۆلۆجی) و مەنتیق. لەکاتێکدا وەك بەهۆی لێکۆڵینەوە سەرکەوتوەکانی گۆتلۆب فرێگە و پیانۆ و لۆرد رەسڵەوە کە لەم بوارەدا کردوویانە دەرکەوتوە کە مەنتیق هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بە سایکۆلۆجییەوە نییە، چونکە مەنتیق وەك لقێکی زانست، بابەتێکی روخسارەکییە و بایەخ بە وێنە و روخسار و چوارچێوەکانی بیر دەدات و پتر بە بابەتی بیرکارییەوە بەندە و بگرە مەنتیق و بیرکاری تەواوکاری یەکترین و بیرکاری لە مەنتیقێکی پەرەسەندو بەولاوە نییە. لەسەردەمی چالاکییەکانی کۆڕی ڤیەننادا سێ ڕێبازی جیاواز لە بواری فەلسەفە و تیۆری زانیندا چالاك بوون. سەبارەت بە زانین سێ بۆچوونیان هەبووە:

یەکەم- لایەنگرانی کانت، بەلایانەوە زانینی راستەقینە ئەوەیە کە لە چوارچێوەی چەمکە پێشیانەکاندا ڕەنگی دەرێژدرێ. لەم پرۆسەیەدا دوولایەن دەستبەکارن، شتێك کە دەزانرێ، لایەنی دووەم ئەو (خۆ)یەی شتەکە دەزانی.

دووەم- بە پێچەوانەوە، پۆزیتیڤیستەکان وایان داناوە زانینی ڕێکوپێك و سیستەم ئاسا تەنیا یەك بنەمای یەك ڕەنگی هەیە و ناکرێ ئەو بنەمایەی زانینە دوورەنگیی بێت (ئێرنست ماخ وتەنی).

سێیەم- لایەنی سێیەم پشت ئەستور بە زانستی سروشت و زمانی فیزیك وەك زمانێکی نێو خۆیەکی، پێ لەسەرئەوە دادەگرێ، ناوەرۆکی بەدەست هاوردووی هەستەکان تاکە بابەت و کەرەسەن زانینیان لێ پێك دێت، تاکە بنچینەن کۆشکی زانینی ڕێکوپێکیان لەسەر بنیات دەنرێ. کارناپ لە کتێبی بنیاتنانی مەنتیقییانەی جیهان سوودی لەم لایەن و بۆچوونە جۆربەجۆرانە وەرگرتووە، بەشێوەیەکی بلیمەت، داهێنەرانە لەو بەرهەمەیدا بەروخسار و ناوەرۆکێکی ترەوە



دایڕشتونەتەوە. لە جیهانبینییە فەلسەفەکەدا پەنای بردۆتە بەر بابەتی دەروونی(نەفسی) و تیۆری زانینی لێ داڕشتوە. بۆ دانانی بەردەی بناغەی زانین سوودی لە بابەتە هەمەجۆرەکانی فیزیکی وەرگرتووە(٢).

٢- کارناپ لە فەلسەفەکەیدا، پشت ئەستور بە بەرهەمەکانی فرێگە و ڤتگنشتاین و پیانۆ و کانتیانیزمی نوێ و ئینجا بەتایبەتی لۆرد بێرتراند رەسڵ، وەك خۆی ئاشکرا لە تەرجەمەی ژیانیدا باسی کردووە، هەوڵی داوە جۆرە گۆڕانێك لە رەوش و پرۆسەی فەلسەفە پیادە بکات. جاران بۆچوون و ناوەرۆکی هەست بابەتی تیۆری زانین بوون، کارناپ وەك فەیلەسوفێکی سەردەمی ئەو شۆڕشانەی لە زانستدا بەرپاکراون، بە مەنتیق و ماتماتیکەوە ئینجا ئەو بابەتانەی ڤتگنشتاین داوینەتە دەست، بە مەبەستی لێکۆڵینەوەو پشتڕاستکردنەوەی بنەما و سەرچاوەی زانین بەگشتی و زانینی مرۆڤ و مەیل و ئارەزوی تاکەکەسان و زانست دەربارەی زانین، ئەم بابەتەی گۆڕیوە بە وشە و لە وشەوە بۆ ڕستە، ئینجا کۆ و سیستەمی ڕستە و ئەمانەش لەلای ئەو بوون بە بابەتی لێکۆڵینەوەی کاری فەلسەفە. ئەم هەنگاوەی کە بابەت و ئەرکی فەلسەفەی بەلایەکی تردا گۆڕیوە بەهیچ شێوە و جۆرێك ئەو بڕوایەی لەق نەکردوە کە بریتییە لەوەی زانینی دەوروبەری راستەقینە هەمیشە بەسەرنج دان و هەستەکان وەك ئامرازێکی زانین، پشت دەبەستێ.

تیۆری زانین کە لە قۆناغێکی پەرەسەندنیدا دەبێ بە مەنتیقی زانست دوو جۆرە بابەتی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لە یەکتری جیا دەکاتەوە کە زانستییانە توێژینەوەیان لەسەر دەکرێت:

ا- شت و کەرەسەی دەوروبەر، رووداو، فاکتەکان... هتد.

زانستەکان بەگشتی ئەمانە دەکەن بە بابەتی لێکۆڵینەوەیان و ڕستە و پرۆپۆزیشن و چەمکی هەمەچەشنەیان لە بارەوە دادەرێژن.





ب- ئەو ڕستە و پرۆپۆزیشن و تیۆری و فۆرمانەی زمان کە زانستەکان لە کار و چالاکییەکانیاندا وەك بابەت بەکاریان دێنن.

بابەتی یەکەم وەك فاکت و کەرەسە زانستە ریالیستییەکان خۆیان پێوە خەریك دەکەن. لێکۆڵینەوەی ڕستە و فۆرمەکانی زمان ئەرکی سەرشانی مەنتیق و شیکردنەوەی سێنتاکسی زانستی مەنتیقە، بەپێی بۆچوونی کارناپ، گۆڕینی تیۆری زانین بەجۆرە مەنتیقێکی زانست، دەبێ ئەرکی سەرشانی فەلسەفەی زانست بێت، واتە مەنتیقی زانست پیادە بکات.

سەرنجدانێکی ورد لە مێژووی پەرەسەندنی فەلسەفە هەر لەو ڕۆژەوە کە ئاینە جیهانییە سەرتاپاگیرەکان بلاۆبونەتەوە، هەوڵی بەرچاو هەست پێ دەکرێن کە بۆ گۆڕینی فەلسەفە بەشێوەیەك لە شێوەکان ئیتر چ ناوەرۆك و بابەت چ گۆڕینی روخسار بێت، دراون. لەم سەردەمەماندا کۆششی کارڵ مارکس و پێشتر دێڤید هیوم و ئینجا لەدواییدا ئێرنست ماخ نموونەن ویستویانە ئەم ئەرکە بە چەند شێوەیەکی لە یەکتری جیا پیادەبکەن، ئەوی بەلای کارناپەوە نوێ و زانستی بووە بەکارهێنانی ئامرازێکی مەنتیقی بووە کە پەرەسەندنی زانستەکان و ژیان هێناویانەتە کایەوە، ئەگەر زانست و ژیان و پرۆسەی نەسرەوتی شارستانی بەپێی هەلومەرجە خۆیی و بابەتیەکان پەرەبستێنن و بەرەو پێش بچن بۆ دەبێ فەلسەفە لەلای خۆیەوە لەم دیاردەیە دوورەپەرێز بێت. بەبێ ئەم گۆڕانانە چۆن فەلسەفە دەتوانێ لافی هاوچەرخێتی و پەیوەندی بوونی بە ژیان و کۆمەڵ و مرۆڤەوە پشت ڕاست بکاتەوە. کارناپ بۆ ئەم مەبەستە لە چەند نووسینێکدا(٣) کۆششی کردووە ئەم گۆڕانە بەپێی پەرەسەندنی زانستەکانی سەردەمی خۆی پیادەبکات و گۆڕان بەسەر شێوە و روخساری فەلسەفەدا بەشێوە کلاسیکییەکەیەوە بهێنێ. بۆیە وای داناوە کە نابێ لەمەولا ئەو بابەتانەی جاران ڕەوا بوون ئیتر هیچی تر فەلسەفە خۆیان پێوە خەریك بکات. بۆ نموونە چەند وشە و چەمکێك دەهێنێتەوە وەك:





یەکەم- بوون و هیچ، بوون و نابوون، شت لە خۆیدا، گەوهەر، ڕەها (موتلەق)، بێ کۆتایی، نامن، گیانی ڕەها، گیانی بابەتی و هتد...

دووەم- یەك ڕەنگی کردنی زانستەکان لەسەر بنەمای زمانی فیزیك. بەلای کارناپەوە هەموو قانونە سروشتییەکان ئەوانەش کە مرۆڤ و کۆمەڵ و ئۆرگانیزمەکان دەگرنەوە لە چەند ئەنجامێکی مەنتیقی قانونە فیزیکییەکان بەولاوە نین.

فیزیك و ئەو زمانەی بەکاری دێنێ دەکرێ وەك بنەما و بنچینە کۆشکی یەکگرتنی زانستە جۆربەجۆرەکانی لەسەر دابمەزرێت. زمانی فیزیك وەك زمانێکی کۆئۆردیناتی بەهۆیە دەکرێ هەموو ڕەوش و بابەتە فیزیکییەکان لە کات و شوێندا دەرببردرێن. سەرەڕای ئەوەی ئەم زمانە زمانێکی نێو خۆیەکی و سیستەمیی هەمەکییە(٤).

زمانی فیزیك کە پەنا دەباتە بەر پەیڕەو میتۆدەی بیرکاری و ماتماتیك بەوەدا لە زمانی ڕۆژانە، زمانی شت، جیا دەکرێتەوە تیایدا لە جێگای چەمکی چۆنێتی (سیفەت و خەسڵەت) چەمکی چەندێتی بەکاردێت. ئەم گۆڕانە جۆرە ڕێکوپێکی و وردیەکی بیرکاری پێ دەبەخشێ و گومان لەو ئەنجامانە ناکرێ کە لە بەکارهێنانی ئەو ئامراز و میتۆدە بیرکارییە دەکەونەوە.

سێیەم- بابەت و ناوەرۆك و ڕستەکانی تیۆری زانین و مەنتیق، بەشێوە ئاساییەکە، لە یەکتری جیاوازن. ڕستە و بابەت و کەرەسەی مەنتیق تاوتۆلۆجین تەنیا روخسار و شێوەن و ناوەرۆکی واقیعییان نییە، ڕستەکانی تیۆری زانین، پڕ مانان و ناوەرۆکی واقیعییان هەیە و دەکرێ بەهۆی پێوانەی ئەزموونی ئیمپریکییەوە ڕاستی و هەڵەیان لە یەکتری هەلاوێردرێن و ساغ بکرێنەوە. بەواتایەکی تر تەنیا ڕستە و پرۆپۆزیشنی شیکاریی و لێکدراو وەك بابەتی زانستییانە پەسند دەکرێن.

٣- ئەوی سەرنج ڕادەکێشێ، کاتی هەڵسەنگاندنی فەلسەفەی کۆڕی ڤیەننا بەگشتی و فەلسەفەی کارناپ بەتایبەتی، ئەو جۆرە یەك ڕەنگییەیە کە لە

جیهانبینییە فەلسەفەییەکەیاندا بەدەردەکەوێ. جیهانبینییەکەیان وادێتە بەرچاو هەروەك ئەوەی سەرتاپای کێشەی مرۆڤایەتی گرتبێتە خۆی، سەرتاپا و سەرانسەری کێشەکانی فەلسەفەی چارەسەر و بەلایەکدا خستبێ، بناغەیەکی پتەوی بۆ یەك رەنگی کردنی زانستەکان دانابێ، چونکە ئامرازێکی کاریگەر بۆ پاکتاوکردنی کێشە لە چارەسەرکردن نەهاتوەکانی فەلسەفەی کلاسیکی لەبەردەستدا بوە. زانینی مرۆڤ تاکە یەك سەرچاوەی هەیە، چارەسەرکردن و بەلایەکدا خستنی کێشەی زانینی مرۆڤ تەنیا بەیەك رێگا دەبێ، رێگای زانست و زانستییانە. کتێبی سەرەکی کارناپ(٥) *بنیاتنانی مەنتیقییانەی جیهان*، راستی ئەم بۆچوونە ساغ دەکاتەوە. ئەم کتێبە لوتکەی پەرەسەندنی فەلسەفەی ئەزموونی (ئیمپرستی) سەدەی بیستەم تۆمار دەکات. ئیمپرستەکان سوورن لەسەر ئەوەی هەموو چەمك و زانینی مرۆڤ بەبێ سێ و دوو لێ کردن لە شارەزایی (خیبرە) کەوتونەتەوە. کارناپ لەم بەرهەمەیدا ئەم تێزەیەی پشتڕاست و ساغ کردۆتەوە. ئەگەر مرۆڤ بەچاوێکی ورد سەرنجی ئەم بەرهەمە بدات جۆری بیرکردنەوەی ئیمپریستی تیادا بەئاشکرا دێتە بەرچاو، بەتایبەتی ئەم سێ بابەتە کە سروشت و مۆرکی فەلسەفەی ئیمپریستی دەستنیشان دەکەن:

یەکەم- پشتگوێ خستنی پرسیار و کێشەکانی ئۆنتۆلۆجی (بوونی گشتی) و بڕوا بوون بەوەی شارەزایی(٦) سەرچاوە و بنەمای زانینە. ئەم لایەنە درێژە و پەرەپێدانی بیروبۆچوونەکانی جۆن لۆك و دێڤید هیوم و ئۆگۆست کۆنتی فەڕەنسایی و جون ستیورات مل و ئینجا ئێرنست ماخی لێکۆلەرەوەی سروشتی ئەڵمانە.

دووەم- بابەت و ئەنجامەکانی زانستی سروشت، بەتایبەتی دوای ئەو سەرکەوتنە سەرتاپاگیرانەی لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا بەدەستی هێنا فەیلەسوفەکانی هاندا پتر لە چالاکی بیریی و زەینیدا پشت بەزانست و پەیڕەو و ئەنجامەکانی ببەستن.



سێیەم- لایەنی مەنتیق و بیرکاریی کە لەلایەن فرێگە و رەسڵ.. هتد. پەرەیان پێ درا. مەنتیقی کلاسیکی وەك ئەرستۆتلس دایهێناوە، کانت وتەنی، پەرەسەندنێکی ئەوتۆی بەخۆیەوە نەدیوە و بەکەڵکی پیادەکردنی ئەو ئەرکەی سەرشانی ئیمپریستەکان نایەت. ڕستەکانی ئەم مەنتیقە لە سێ بەشی سادە پێك هاتوون:

بکەر، ئامرازی پەیوەندی، بار. لەم رستانەدا تەنیا خەسڵەت و چەندین سیفەتی بار (Eigenschafts Prädikate) لەبەرچاو دەگیرێ وەك (مرۆڤ) یاخود (دەمرێ). پەیوەندی بارەکی کە لە زانستدا رۆڵی بەرچاوی هەیە لەم مەنتیقەدا نییە بۆیە هەوڵ درا پشت بە مەنتیقی نوێ ببەسترێ بەتایبەتی دوای ئەوەی ماتماتیك وەك ئامراز و پەیڕەوێك لە زانستەکاندا پەنای برایە بەر و ساغ بۆوە کە مەنتیقێکی پەرەسەندووە. کێشەی زانست و سەرچاوەکانی و زانینێکی دڵنیایی لێ کراو چۆنیەتی پەیدابوونی بابەتێك بووە لەو بابەتانەی ئەم رێبازە نوێیە پێیانەوە خەریك بووە. پشت ئەستور بە مەنتیقی نوێ، کارناپ لە سیستەمێکی چەمکەکانیدا کە ناوی تیۆری دامەزراندن یاخود تیۆری بنیاتنانی لێ ناوە(٧) تیادا چەمکەکانی زانستە ریالییەکان بەهۆی زنجیرە پێناسەکردن و دەستنیشانکردنێك دەگەڕێنرێنەوە سەر چەند چەمکێکی ئیمپری — ئەزموونی بنچینەیی... ئەگەر ناوەرۆك و بابەتی هەستەکان تاکە سەرچاوەی زانین بن، دەکرێ هەموو چەمکە زانستییەکان و بگرە هەموو چەمکەکانی زانستەکان بگەڕێنرێنەوە سەر ئەو بنچینەیەی کە زانینی لێ پەیدا دەبێ، بەواتایەکی تر:

چەمکێکی دیاریکراو کە سەر بە بابەتێکی تایبەتی یاخود دیاریکراوە، پێناسەیەك یاخود زنجیرە پێناسەیەکی بۆ دابین دەکرێت. لەم ئەرك و کارەدا تەنیا جۆرە چەمکێك کە راستەوخۆ پەیوەندییان بە ناوەرۆکی هەستەکانەوە هەیە پەنایان دەبرێتە بەر و بەکاردێن.





ئەم چالاكییە لای كارناپ بە دەستنیشانكردن و دامەزراندنی چەمك ناودەبرێ. چەمكێك دەست نیشان بكرێت مانای ئەوەیە: بنەمایەكی گشتی دابرێژدرێ بەهۆیەوە هەموو ئەو رستانەی ئەم چەمكەیان تیادایە بە ڕستەی تر بگۆڕدرێنەوە كە چەمكی تریان تیادایە(٨). هەر چەمكێك لەم سیستەمەدا شوێنی دیاریكراوی خۆی هەیە. لەم سیستەمەدا چەند چەمكێكی بنەڕەتیی هەیە كە وەك بنەمایەك پلەئاسا چەمكەكانی تریان لێ دەكەونەوە. ئەمەش وا دەگەیەنی كە زانستە رێئالیستەكان تەنیا یەك مەڵۆ و مەیدانی بابەتیان هەیە. لە مەیدانی كەرەسە و بابەتیاندا جۆرە یەك ڕەنگییەك دەبینرێ، هەروەها هەر ڕستە و دەربڕینێكی زانست دەكرێ بە جۆرێك فۆرمەكەی دابرێژرێتەوە كە ببێ بە دەربڕینی ڕستەیەكی بنەرەتی(٩). كەوابوو تەنیا یەك مەیدان و یەك جۆرە كەرەسە و بابەت و یەك زانست هەیە. ڕەنگ ڕشتنی ئەم جۆرە سیستەمە پێویستی بە كەرەسەی تایبەتی هەیە و ئەو كەرەسەیە بەلای كارناپەوە شێوە و ناوەرۆكی تێزەیان هەیە، ئەم تێزانە دەكرێن بەدوو بەشەوە:

یەكەم- تێزەی فۆرمی روخساریی (كەرەسەی بنچینەیی و پەیوەندی مەنتیقی).

دووەم- تێزەی ماددی(١٠). (ناوەرۆكی هەستەكان وەك سەرچاوە...).

لە بەشی یەكەمدا (فۆرم و روخسار) پەیڕەوی سیستەمەكە پەرە پێ ئەدرێ و ئەو مەرجانە دیاری دەكرێن كە چەمكە بنەڕەتیەكان و بەستنەوەیان بە شارەزاییەوە و فۆرمی پێناسەكان بەگشتی دابین دەكات. ئەو زمانەی لە بەشی یەكەمدا بەكاردێت زمانی سیمبۆلی مەنتیقی نوێیە. بەتایبەتی ئەوەی لە كتێبی *پرنكیپیا ماتماتیكای* بێرتراند رەسڵدا پەرەی پێدراوە(١١). رۆدولف كارناپ مەبەستی باسكردنی ئەم سیستەمە و قسەكردن لەبارەیەوە لەوەدا دەبینێ كە ئەو میتۆدە و پەیڕەوەی بۆ دامەزراندنی ئەم سیستەمە پێویستە لێكۆڵینەوەیەكی مەنتیقی لەسەر بكرێت(١٢)



لە لایەنی ماددیدا، كە لە دوای بەشی یەكەمەوە دێت، نەخشەیەك كە لە پەیڕەوی دامەزراندنەكەدا ڕێی بۆ خۆشكراوە، دادەڕێژدرێ. نەخشەكە بریتی دەبێ لە چەند بابەتێك، وەك هەڵبژاردنی چەند چەمكێكی بنەڕەتیی، دیاریكردنی سەجەرەیەكی پلە بە پلەی پێناسەكان، مەڵۆكردنی ئەو چەمكانەی لە زانستە ئەزموونی — ئیمپرییەكاندا بەكاردێن، ئینجا دامەزراندنیان لەو سیستەمەی كە نیازی داڕشتنیمان هەیە.

سەجەرەی چەمكەكان بەپێی دوو پێوانە ڕێك دەخرێت:

یەكەم- بەپێی بنیادی مەنتیقی، واتە بۆ پێناسەكردنی دوا چەمك پشت بە چەمكەكانی پێشووتر دەبەسترێ.

دووەم- بەپێی پەیڕەوی تیۆری زانین دوا چەمكەكان دەگەڕێنرێنەوە بۆ سەر چەمكە سەرەتاییەكان.

پەیڕەوی مەنتیق شیكاری و توێ توێ كردنە، تیۆری زانین لە چالاكییەكەیدا بنیادنەرو لێكدان دەگرێتەبەر. ئەنجامگیریی لە مەنتیقدا لە جێگۆڕكی و پلە گۆڕینی هیما و چەمكەكان بەولاوە نییە و هیچ جۆرە چەمكێكی نوێ دەستگیر نابێت. كەچی، بەپێچەوانەوە، شیكردنەوەی تیۆری زانینیانە، وەك میتۆدەیەك، لەو بابەتەی شیدەكاتەوە چەمكێكی نوێ دەستگیر دەبێ كە پێشتر لە مەرج و دراودا نەبووە.

تیۆری زانین بابەت و چەمكەكانی زانست شیدەكاتەوە بۆ ئەوەی ساغی بكاتەوە، زانینی بابەتێك بە كام بابەتی ترەوە بەندە. لێرەدا بابەتەكانی پلەی سەروو دەگەڕێنرێنەوە بۆ سەر بابەتی پلەی ژێرەوتر كە هیچی تریان لەژێرەوە نییە و وەك بنچینە و بنەمای تیۆری زانین دادەنرێن. كارناپ وای داناوە، كە بابەتەكانی فیزیك لە بۆچوونی تیۆری زانینەوە لە چاو بابەتەكانی ڕەوانیی خۆیەكی پلەو پایەی دووەمیان هەیە، چونكە كەرەسە و بابەتەكانی فیزیكی لە هەستەكانەوە دەكەونەوە





و ((من خۆم)) بنەڕەتی پرۆسەکەیە.... ئیتر لە سیستەمی تیۆری زانیندا چوار جۆرە بابەتی لەم شێوەیە هەیە:-

یەکەم- بابەتەکانی دەروونی خۆیەکی (نەفسی من، خۆم).

دووەم- بابەتە فیزیکییەکان.

سێیەم- بابەتەکانی دەروونی بیانی (نەفسێکی تر، نامن).

چوارەم- بابەتە گیانییەکان.

بەلای کارناپەوە بابەتی یەکەم لەژێرەوەیە وەك بنچینەیەك و ئەوانی تر لە ژوورووەوەن و دەگەڕێنرێنەوە بۆ سەر یەکەم. بابەتی کولتور و مێژوو، زانستی کۆمەلایەتی و خەسڵەت و پەیوەندی و رووداو رەوشی بابەتی گیانییان پێ دەوترێ.

٤- لە ساڵی ١٩٣٤ کارناپ لە ڤیەننا کتێبی *(سێنتاکسی مەنتیقی زمان)* ی بلاوکردەوە. لەو بەرهەمەیدا گۆڕانێکی سەرتاپاگیری لینگویستی (مەنتیقی زمان) بەرپا کردووە، کە لە فەلسەفەی شیکاریی و تیۆری زانستی رۆڵێکی بەرچاوی گێڕاوە. لەو لێکۆڵینەوەیەدا نووسەر ئەرکێکی فەلسەفەی زانستی لەوەدا دیتوە جۆرە زمانێکی فۆرماڵی روخسارەکی دابنێ. واتە زمانێك وەك ئامراز بۆ دارِشتنی رستە و دەربڕینە زانستییەکان بەکار بێت، کارناپ لەو بەرهەمەیدا وشەی (سێنتاکس و مێتامەنتیق)ی بەیەك مانا و مەبەست بەکارهێناوە. سێنتاکسی زمانێك بریتییە لە دانانی ئەو بنەمایانەی رستەکانی زمان بەهۆیەوە لە وشە و بەشە وشە پێك دێن.

زمانی دارێژراو (هونەریی)، بەپێچەوانەی زمانی ئاساییەوە کە لە وشەی ئاسایی پێك هاتووە، بەندە بە چەند قانون و بنەمایەکی تەکنیکی زمانەوە کە تەنیا بایەخ بە روخساری رستە و دەربڕینەکان ئەدات بۆیە ئەم بنەمایانە بنەمای سێنتاکسیان



پێ دەوترێ. لەلایەکی ترەوە، بنەماکانی سێنتاکس بەوەدا لە بنەماکانی ئەنجامگیری مەنتیق جیاوازن کە یەکەمیان بنەمای روخسارەکین و ئەوانی تر بریتین لە بنەمای جۆرە دارِشتنەوەیەکی روخسارەکانی رستە و دەربڕینەکان[١٣].

لە سێنتاکسی مەنتیقیدا دوو جۆرە زمان دەستنیشان دەکرێن کە لەکاتی تێکەڵ بەیەکتری کردنیان چەندین کێشە و گرفتی ئاڵۆز و تەمومژاوی دەکەونەوە.

یەکەم- زمانی بابەت، زمانی زانستییە ئیمپریەکان و زمانی بیرکارییە، ئەم زمانە وەك کەرەسە بابەتی دەوروبەر و فیزیکیی فۆرمولە دەکات و بە رستە دەریان دەبڕێت.

دووەم- زمانی سێنتاکس[١٤] یاخود مێتا زمان. کەرەسە و بابەتی لێکۆڵینەوەکانی ئەم زمانە بریتیە لە زمانی بابەتی. ئەگەر زمانی یەکەم پەیوەندی بە بابەتەکانی جیهانی دەوروبەرەوە هەبێ و دەریان ببڕێ، ئەوا زمانی دووەم لە چالاکییەکانیدا زمانی یەکەم دەکات بە کەرەسەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە. بە واتایەکی تر ئەگەر زمانی یەکەم بە رستە باسی سروشت بکات ئەوا زمانی دووەم ئەو رستانەی باسی سروشت ئەکەن دەکات بە بابەتی توێژینەوەی خۆی. لەلایەکی ترەوە شیکردنەوەی سێنتاکسی مەنتیقی رستە و بابەتەکانی میتافیزیك دەریدەخات کە دوو جۆرە شێوە زمانی تر هەیە کە پێویستە بە وردیی لەبەرچاو بگیرێن:

یەکەم- زمانی روخساریی، فۆرمیی.

دووەم- زمانی ماددی.

کارناپ دەڵێ، پشتگوێ خستنی ئەم دووجۆرە بەکارهێنانی شێوە زمانانە هەڵەی گەورەی لێ دەکەوێتەوە بەتایبەتی لە مەیدانی فەلسەفە و میتافیزیکدا. فەیلەسوفەکان زۆرجار رستە بەکاردێنن و وای دادەنێن کە بەو رستانە باسی شت و





خەسڵەتەکانی دەکەن، کەچی مەسەلەکە وانییە. ئەوان بەو ڕستە و قسانەیان تەنیا باسی چەند چەمك و ڕستە و دەربڕینێکی زمان دەکەن و قسەکانیان فڕێ بەسەر شت و بابەتی واقیعییەوە نییە. بۆ نموونە ئەو ڕستەیەی دەڵێ: هەموو شتێك لە ئەتۆم و شتی وردیلە پێك هاتووە، یاخود هەموو بابەتە جەستەییەکان لە هەست بەولاوە نین. ئەگەر بێتو ئەم ڕستەیە جارێکی تر بەشێوەیەکی راست بە زمانی روخساریی فۆرمیی دابڕێژرێتەوە شتێکی تری لێ دێتەکایەوە.

زمانی ژیانی رۆژانە، زمانی ئاسایی لە وشە و سێنتاکس، واتە لە چەند وشەیەك کە مانا و واتا بەخشن و لە چەند بنەمایەکی داڕشتنی ڕستەکە پێك هاتوە. ئەو بنەمایانە نیشانی ئەدەن چۆن ڕستە دادەڕێژدرێ. کەوابوو چۆن زڕە ڕستە دەکەونەوە، ئەو زڕە رستانەی هەندێ جار لەسەر شێوەی کێشەیەکی فەلسەفە — میتافیزیك دێنە بەرچاو؟!

بەهۆی پەرەسەندنی ژیان و کۆمەڵ و مێژوو، زمان و پێکهاتەکانیشی تارادەیەك، کەم تا زۆر، لەرێزمان بەدەر و گۆڕانی بەسەردا دێت. بۆ نموونە وشەیەك ماناکەی دەگۆڕدرێ، بەجۆرێك مانا کۆنە باوەکەی بەکارهێنانی نامێنێ و مانایەکی نوێی پێ نابڕێ. لێرەوە زڕە چەمکێك پەیدا دەبێت. لە سەردەمی خۆیدا وشەی لاتینی (ئەوروپایی) *پرینسیپ* کە مانای بنەما و بنچینە و سەرەتا دەگەیەنێ لەگەڵ وشەی بوون گرێدرابوو. ماناکەی کاتی خۆی پەیوەندی بە کات و دەستپێکردنی کاتەوە هەبووە، واتە ئەوەی بەپێی کات لەپێشەوە بە یەکەم دێت، ئینجا واتای کاتەکەی دۆڕاندوە و بووە بە یەکەم لەنێوان ئەوانی تردا. کەچی میتافیزیکییەکان وشەکە هەر بە مانای جارانی بەکاردێنن و دەپرسن بنەما و بنچینەی جیهان چییە؟ بێ گومان مەبەستیان لە سەرەتای دەستپێکردنی پەیدابوون و ئینجا ئەو کەرەسەیەیە کە یەکەم جار جیهان لێی دروست بووە. لەم پرسیار و بۆچوونەوە زڕە کێشەیەکی میتافیزیکی کەوتۆتەوە و رۆڵی ئامرازی سێنتاکسی زمان بۆ روونکردنەوەی ئەم



جۆرە هەلاَنە کە لە ئەنجامی تێکەڵاوکردنی بابەت و وشە و شت و، لە ئەنجامی نەزانینی پێکهاتەی مەنتیقی زمان دەکەونەوە، دەردەکەوێ.

شان بەشانی فرێگە و ڕەسڵ و ماخ و ڤتگنشتاین و ئەندامانی تری کۆڕی ڤیەننا، رۆدولف کارناپ بەرابەرێکی گرنگی فەلسەفەی پوزیتیڤیزمی نوێ دادەنرێ. لە نووسینەکانیدا سەرکەوتوانە بنەما سەرەکییەکانی ئەم رێبازە فەلسەفییەی ساغ و پشتڕاستکردۆتەوە. لە سیستەمە سەرتاپاگیرییەکەیدا کە لە کتێبی *بنیاتنانی مەنتیقی جیهاندا* ڕەنگی ڕشتوە، ساغیکردۆتەوە دەکرێ بە یارمەتی چەند پەیوەندییەکی بنەڕەتیی مەنتیقی وەك پەیوەندی -لە یەکتری چوون- سیستەمەکە دابمەزرێ، چونکە پەیوەندییە بنەڕەتیەکان خۆیان، نەك رەگەز و کەرەسە بنەڕەتییەکان، چەمکی بنەڕەتی بێگەردی پێناسە نەکراون.

لە چوارچێوەی جیهانبینی فەلسەفەدا، لە کەرەسەی مەنتیق و بە یارمەتی ئامرازی بەدەست هاتووی مەنیتقی نوێ لە چوارچێوەی ئەم سیستەمەدا کە نیازی دامەزراندنی هەیە، جیاوازییە چۆنیەتیەکان کە لە نێوان شێوەکانی بزوتنەوەی ماددەدا هەن دەگەڕێنرێنەوە سەر جیاوازیی چەندیەتی[١٥]. بەم هەنگاوە رێگای پرۆژە سەرەکییەکەی کۆڕی ڤیەننا خۆشکراوە، رێگای یەك ڕەنگی کردنی زانستەکان. کارناپ هەوڵی داوە روونی بکاتەوە، دەکرێ بنەڕەتی دەروونی (نەفسی) پرۆژەکە بە بنەڕەتی فیزیکی بگۆڕدرێ و دووەم لە جێگای یەکەم بەکاربێت. تێکرای چەمکەکانی زانست دەبێ لە چەمکەکانی فیزیك بکەونەوە و پەیدابن. کارناپ وتویەتی: ئێمە لێرەدا لایەنی رەوانی و کەرەسەی فیزیکی بەدوو بنەڕەت یاخود بەدوو لایەنی جیهان تێ ناگەین. ئەمانە چەند فۆرمێکی رێکخستنی یەك بابەتن، هی مەیدانێکی یەکگرتوو و یەك ڕەنگی بێ خەسڵەتن[١٦]. کەرەسە و بابەتە گیانییەکان دەگەڕێنرێنەوە سەر بنەما و بابەتە





دەروونییەکان و ئەمانەش بۆ سەر بنچینە فیزیکییەکان. زمانی فیزیك وەك زمانێکی هەمەکی دەبێ بە بناغەی بنیاتنانی کەژاوەی زانستەکان.

٥- وەك لە نووسین و بلاَوکراوەکاندا دەردەکەوێ کارناپ زۆربەی شاکارەکانی و کات و چالاکی و بیرکردنەوەی فەلسەفی خۆی بۆ مەنتیق و تیۆری زانینی زانستیانە و زانست و بەگژداچوونی ڕێباز و بیروبۆچوونەکانی میتافیزیك داناوە. لە بۆنەی تایبەتیدا لەم ڕێگەیە لای داوە و بۆچوون و هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە ژیان و دیاردە کۆمەلاَیەتیەکان دیاریکردووە.

لە تەرجەمەی ژیانیدا کە ساڵی **١٩٦٣** بە ئینگلیزی و ساڵی **١٩٩٣** بە زمانی ئەڵمانی بلاَوکراوەتەوە، لەژێر ناونیشانی، *ئەو ڕێگایەی لە فەلسەفەدا گرتمەبەر*، زۆر بەکورتی بەلاَم بە پوختی وەلاَمی ئەو پرسیارە دەداتەوە، پوختە و جەوهەری ئایین[17] چییە و دەبێ چۆن بێ؟ لەوەدەچێ کە دایك و باوکی وەك عیسایی، بەدین بوون و ئایین کارێکی گەورەی لە ژیانیان کردوە و ئەوانیش بەلای خۆیانەوە کاریان لە کارناپ کردبێ. کارناپ لە دایکییەوە، ئاکار و ڕەوشتی جوان و چاکەخوازی بەسەر مەشقی ژیان داناوە و لەو باوەڕەدابووە، ئیمانداریی و بڕوابوون (عەقیدە) پوختە و جەوهەری ئایین نین. بەڵکو جەوهەری ئایین لەوەدایە، چۆن مرۆڤ ژیانێکی دوور لە بەدکاریی بەسەردەبات. کەسانی تر چۆن و چ ڕەفتارێك دەکەن و بڕوایان چۆنە و بەچییە، مەسەلەیەکە تایبەتە بە خۆیان و دەبێ پەسند بکرێت ئەگەر هاتوو سەرگەرمی بەدوادا گەڕانی ڕاستی و هەقیقەت بین.

ئەو بۆچوون و بڕیارەی کارناپ و خێزانەکە کە بەمانا ئاینیەکەی سینگ فراوانیی و دڵ و دەرون کراوەییەکی لەسنور بەدەری تیادا دەبینرێ، نە لەگەڵ بڕوای تایەفەی عیسایی دەگونجێ و نە پەیوەندی بە ئایینی دانپیادانراوەکەوە هەیە. کارناپ ئایین بە بڕوا و ئیمان دانانێ و دەیخاتە نێوخانەی تاکەکەسییەوە و هەرکەسە بۆخۆی ئازادە و



دەتوانرێ بڕوا بهێنێ یان بێ باوەڕبێ! پێداگرتنی لەسەر بنەماکانی ئاکار شتێکی سەرنجراکێشە. ڕاستە ئاکار بە ڕێوشوێن و بنەماکانیەوە هەمیشە لە چوارچێوە گشتییەکەدا ڕێژەیین، بەپێی کات و شوێن و کۆمەڵ و هەلومەرجەکان دەگۆڕێن، بڕواناکەم کارناپ لاری لەمە هەبووبێ، بەلاَم ئەوی لێرەدا جێگای گومانە، ئاکار هەمیشە دروشمێك بووە بۆ کۆنترۆڵکردنی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە. بۆ نموونە لە ئایینیدا چ ئاسمانی و چ نا ئاسمانی پێ لەسەر ئاکار دادەگیرێ بۆ ئەوەی سنور بۆ کردەوە و چالاکی و بیرکردنەوەی مرۆڤ دابنرێ و ئینجا ئۆباڵ سەرگەردان بکرێت، بەمەش ئازادییە ڕاستەقینەکە نەك هەر نیوەچڵ دەکرێ بەڵکو دەکرێ بە ئازادی بەندە و کۆیلە و ئەشعەری وتەنی، مرۆڤ (جوزیی ئیختیاری)دەبێ. کەوابوو چۆن کارناپ، بەبێ دەستنیشان کردنی تەواوەتی، باسی ئاکاری کردووە؟!

لە لایەکی ترەوە بەلای منەوە سەیر نییە کە کارناپ ئایین بکات بە جۆرێکی تایبەتی ژیان بەسەربردن، چونکە وەك من بۆی دەچم، عیسایی بەو شێوەیەی ئێستاکە هەیە نە لە ڕوخسار و نە لە ناوەڕۆکدا ئایین نییە بەڵکو جۆرێکە لە بڕوا (عەقیدە).

ئەگەر لایەنە تیۆرییەکەی بخەینەلاوە، وەك بڕوابوون بەسێ ڕەنگی (ڕەب) و عیسا ڕۆحی خوایە و مریەم (عەزرایە)و.... هتد، ئەوا لایەنەکەی تری بەرێکوپێکی نیشانی ئەدات و بگرە ساغی دەکاتەوە کە عیسایی لەم لایەنەیدا لە دیاردەیەکی کۆمەلاَیەتی ژیان بەولاوە نییە و هیچ پەیوەندی بە (ئاسمانەوە!) نەماوە. شتێك پێی بوترێ (ترسی خوا — Fromigkeit) لە دڵی عیساییدا نییە. چوار جۆرە ئنجیلەکەی لەلایەن کڵێساوە پەسندە، کەسانی دیاریکراو دایان ناوە و من بەشبەحالی خۆم چەند جارێك خوێندومنەتەوە لە فەلسەفە و لاهوتی کۆمەلاَیەتی و ئامۆژگاری سادە و ساکار بەولاوە شتی ترم تیایاندا هەست پێ نەکردووە. ئەوەی هەفتەی جارێك، ڕۆژانی یەك شەممە — لە کڵێسادا بەناوی نوێژەوە (بە ئەڵمانی خزمەتی ڕەبی پێ دەوترێ: Gottesdienst) سازدەکرێ هەر لە ئاهەنگی تایبەتی





دەچێ، ئیتر چ لەبارەی ئەو بەشداربووانەوە بێ، پیاو و ژن و منداڵ، کە بە جلوبەرگی ئاڵا و واڵا و ئارایشتی دەموچاو خۆیان رازاندۆتەوە، یاخود چ بەو مۆزیکە بێ کە لێدەدرێ و ئەو (گۆرانی)یەی وەك کۆرس بەشداربووان دەیڵێن.

خواردنەوەی شەراب (گوایە عیسا رایسپاردون) ئێواران بە شتێکی پێویست (لەگەڵ نانی شێوان) دادەنرێ. ئەوی لە ئاینە ئاسمانییەکاندا قەدەغەیە -خواردن و کردن- چاوی لێ دەنوقێنرێ و باس ناکرێن[١٨].

ئەگەر ئەم لایەنە لەبەرچاوبگیرێ، ئینجا لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی کارناپدا بخرێنە نێو دووتای تەرازوویەکەوە، بەتایبەتی لەگەڵ بیرو و بۆچوونەکانی دەربارەی زانست و ژیان و کۆمەڵ و پاشەرۆژ ئاوێتە بکرێن، دەکرێ بوترێ:-

یەکەم- ئەگەر لایەنە تیۆرییەکە کە پێشتر باسمان کرد لە ئاینی عیسایی بکرێتەوە ئەوا شتێك دەمێنێتەوە کە لە دنیایی بەولاوە هیچی تر نییە. ئەو کاتە هەر لە رێکخراو و ئۆرگانێکی تایبەتی دەچوو.

دووەم- مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی ژیر و کۆمەڵایەتی نە دۆستێکی ئاسمانی هەیە بیپارێزێ و نە دوژمنێکی لە سروشت بەدەری هەیە دووچاری بەدکاریی بکات. هەموو شتێك بەدەست مرۆڤ خۆیەتی. ئەوی لە توانادا هەبێ بۆ چاککردنی کاروباری ژیان بکرێت[١٩]، ئەرکێکە کەوتۆتە ئەستۆی مرۆڤ خۆی.

سێیەم- شتێك نییە پێی بوترێ چارەنووس، واتە مرۆڤایەتی، بگرە مرۆڤ ئەو توانایەی هەیە هەلومەرجەکانی ژیان بەجۆرێك وەربگێڕێ زۆر لە کوێرەوەری و بەدبەختی و ناخۆشییەکانی ژیانی سەردەم کەم بکاتەوە. ژیانی تاکەکەسان و کۆمەڵانی خەڵك و ئینجا هەموو مرۆڤایەتی لە جەوهەر و پوختە و بنچینەدا باشتر بکات[٢٠].



چوارەم- رەفتار و کرداری سەرکەوتوانە و دوور لە هەڵە و تێشکان و کەم و کورتییەوە ئەوەیە کە بە زانین و زانست پشت ئەستورە- زانست ئەو رێگا و ئامرازەیە کە رێنمایی دەکات و زانین دەداتە دەست. کەوابوو پشت بەستن بە زانست و زانست، نەك ئاین — ئەو رێگا و ئامرازەیە کە دەبێتە مایەی خۆشیی ژیان و بەختەوەری و رەواندنەوەی خێوی نەداریی و کلۆڵی و هەژاری و نەخۆشی. مەسیحیەت وەك ئاین بەڵێنی پاشەرۆژ دەدات، بەڵێنیش باری سەرشان سوك ناکات، نەخۆشی چاك ناکاتەوە سکی برسی تێر ناکات و زۆرداریی لا نابات بەڵکو ساتەکی دڵ خۆش دەکات و دەردەکە دوادەخات.

پێنجەم- کەسایەتی مرۆڤ، لە هەموو سات و کۆمەڵ و جێگایەکدا ئەو فاکتەرەیە هەڵوێست و کرداری مرۆڤ دیاری دەکات. ئایدیۆلۆجی و بیروبۆچوونی باو و دەستبەکار زۆر بەکەمی لەم بوارەدا دەور دەگێڕن.

شەشەم- راستە یەك ژیان هەیە و یەك جار مرۆڤ دەژی و ئەوی مرد دنیای لێ خراپ دەبێ، بەڵام دنیا خراپ بوون نییە، دنیا هەر هەبووە و هەر دەمێنێ... بەڵام وەك جیهانبینی فەلسەفە سێ جۆرە جیهانی جیاواز و سەربەخۆ هەیە:

أ- ئەو جیهانە راستەقینەی لە خۆیدا هەیە.

ب- ئەو جیهانەی مرۆڤ بە هەستەکانی دەرکی پێ دەبات.

ج- جیهانی زانستی فیزیك کە وێنەی جیهانی زانستی پێ دەوترێ.

فەلسەفە نا هەقی نەبووە کەوتویەتی جیهانی راستەقینە پێویستە بەوردیی و زانستییانە بزانرێ و دەرکی پێ ببردرێ. جیهانی دووەم کە بە هەستەکان دەرکی پێ دەبردرێ بەشێوەیەکی رێکوپێك لێك بدرێتەوە.





گۆڕان و گۆڕین سەرمەشقی ژیانن، بەڵاّم لێرەدا ئەوی پەیوەندی بە گۆڕینی جیهانەوە هەیە شتێکە لەگەڵ سروشتی جیهان خۆیدا ناگونجیٚ. فەلسەفە و زانست و ژیانی رۆژانە و بە تاقیکردنەوە جۆربەجۆرییەکانیەوە ساغیان دەکردەوە ئەو گۆڕانەی جیهان کە مەبەست و ئامانجێکی تایبەتی سیاسی و ئایدیۆلۆجی لە دواوەیە بەپێچەوانەی سروشت و هەلومەرجەکانی ژیانەوەیە و ناتەبایە لەگەڵ ئەوەی ژیان پەسندی دەکات، گۆڕان بەو مانایە لەکردن نایەت بەڵکو پەرەسەندن و پەرەپێدانی سروشتی و پرۆگرامەکی دەگونجیٚ باس بکرێن. پەرەپێدان و گەشەکردنی ژیان و سروشت و جیهان گرەو دەبەنەوە و نیشانی مەبەست دەپێکن. پەرەسەندن بنەما و سەرمەشقی ژیانە و گۆڕینی بە تۆبزی و بەکوتەك سەپێنراو ئەگەر بە ئایدیۆلۆجی سیاسیش پشت ئەستور بێت مایەکەی هەر ئاشبەتاڵییە.

کەوابوو لە وەڵاّمی پرسیاری: گۆڕین یان پەرەپێدانی لەسەرخۆ و هەنگاو ئاسایی؟ دووەم هەڵدەبژێردریٚ. ئایین، بەتایبەتی ئاینی عیسایی لە ئەوروپا راستی ئەم قسەیە ساغ دەکاتەوە. ئەو ئاینە بەهێزە سەرتاپاگیرە هیچ کاتێك نەیتوانیوە کۆمەڵ بەو جۆرە بگۆڕیٚ کە ویستوویەتی، بەپێچەوانەوە کۆمەڵ خۆی بەپیٚ سروشتی تایبەتی خۆی پەرەی بە ئاینەکەداوە بە جۆرێك لەگەڵ خۆیدا بگونجیٚ. هەبوونی چەند مەزهەبێك لە چوارچێوەی ئایندا، وەك کاتۆلیك و پرۆتستانت لە چوارچێوەی یەك ئاینی مەسیحیدا راستی ئەو بۆچوونە ساغ دەکاتەوە کە پەرەسەندن شتێکی سروشتیە نەك گۆڕانی ریشەیی و گۆڕانێك لە دەرەوە و لە سەرەوەی کۆمەڵ و ژیان و لە چوارچێوەی ئایدیۆلۆجی و سیستەم و بۆچوونێکی سیاسیدا ڕەنگی بۆ ڕێژدرابیٚ و بە کوتەك پیادەبکریٚ. پەرەسەندن پرۆسەیەکی سروشتییە و بەپیٚی هەلومەرجی کۆمەڵ جێگای خۆی دەکاتەوە.

حەوتەم- ئەوەندەی من لە بابەتەکە بگەم و بەپیٚی ئەو شارەزاییەی لە مەیدانی فەلسەفەدا هەمە، بەهیچ جۆرێك بۆچوون و بڕیارەکەی کارناپ دەربارەی ئایین،



دەربارەی پەیوەندی دەستیاوی نێوان ئایین و بنەماکانی ئاکار نەك هەر پەسند ناکەم بەڵکو بە نادروستیان دادەنێم. هۆیەکەش جیاوازی پەروەردە و ئایین و ژیانی کۆمەڵاّیەتی نییە. راستە کارناپ لە کۆمەڵگایەکی مەسیحی ئایین کراوە و سینگ فراوان و لە سێبەری داد و ئازادی و دیموکراتیدا گوش کراوە و گەورە بووە، وەك خۆی وتویەتی پەروەردەیەك کراوە، بەزەیی و دەست پاکی و بەدەست و دڵ و نیاز پاکی سەرمەشق بوون. بەپێچەوانەوە لە رۆژهەڵاّتدا یەك رەنگیی و سیستەمی ستەم و سەرتاپاگیر هەمیشە رەنگی ژیانیان بە هەموو شێوە و ئۆرگانەکانیەوە رشتوە. ئازادی، دیموکراتی، یەکسانی و داد چەند وشەیەکی نامۆن و نەبیستراون و هیچ کاتێك پەرەسەندن، دیموکراتی و ئازادی و داد دانویان لەگەڵ رۆژهەڵاّت نەکولاّوە. نەخێر ئەمە هۆیەکە نییە.

بە بۆچوونی من هیچ جۆرە پەیوەندییەکی هۆیەکی — ناچارەکی لەنێوان بڕوا و بنەماکانی ئاکاردا نییە. راستە لە سەرانسەری جیهانداو بەدرێژایی سەردەم و کات و قۆناغە جیاکانی پەرەسەندنی مرۆڤ و کۆمەڵ، سەردەم و جێگا نەبوە کە ئاینی تیادا نەبیٚ. ئاینیش نەبوە، جا ئیتر هەرێمی بووبیٚ یاخود جیهانیی، ئەگەر پیٚی لەسەر بنەماکانی ئاکار دانەگرتبیٚ و بە تۆبزی داوای لە لایەنگیرانی نەکردبیٚ پەیڕەوی ئەو بنەمایانەی ئاکار بکەن کە خۆی ڕەنگی ڕشتون و وەك خۆی بە ڕاستی داناون. وەك لە مێژووی پەرەسەندنی ئاینی مەسیحییەوە دەردەکەویٚ، هەر لە سەدەی یەکەمەوە کە هەموو ئینجیلەکان دانراون و پەیامی پەیامبەرانی بلاّوکراونەتەوە تا ئەو سەردەمەی سەدەکانی ناوەڕاست کۆتاییان پیٚ هێنرا و ئایین و دەوڵەت لە ئەوروپادا لە یەکتری جیاکراونەتەوە دەردەکەویٚ کە پیٚ داگرتن لەسەر بنەماو ڕێوشوێنەکانی ئاکار بە مەبەستی ملکەچکردنی مرۆڤ و کۆنترۆڵکردنی بووە نەك بە مەبەستی بلاّوکردنەوەی کرداری جوان و رەوشتی باش و پاك. لەم سەردەمەماندا کە سەردەمی شۆڕشی تەکنەلۆجییە و زانست و ڕۆشنگەری هەموو





كون و قوژبنێكیان روونكردۆتەوە پتر تیشك خراوەتە سەر ئەم لایەنە. بە كورتی هیچ مەرج نییە مرۆڤی بە ئیمان ئاكاری جوان بێت و كەسانی رۆشنبیر هەن ئەوپەڕی رەوشت و كردار جوانن و هیچ جۆرە بڕوا و ئیمانێكی ئاییینییان نییە. رەوشت جوانی و ئاكار رەنگینی كاتێك نرخ و بایەخیان دەبێ كە ترس و سود و قازانجیان لە دواوە نەبێت. ئەگەر هاتوو ترسی دۆزەخ و مەترسی دەسەلآت و پۆلیس هۆكاری كارێكی جوان بن، ئەوكارە هیچ كاتێك بایەخێكی ئاكارەكی نابێت، چونكە ئەم چاكەكارییە لە خواست و ئیرادەیەكی ئازادەوە ناكەوێتەوە و نەكەوتۆتەوە. كرداری جوانی ئاكارەكی ئەو كردارەیە كە بە وەدەستهێنانی سودێك یاخود خۆ بواردن لە زیان و ترسێكەوە بەند نەبێ بۆیە دەڵێم بەهیچ جۆرێك پەیوەندی ناچارەكی — هۆیەكی لەنێوان ئیمان و ئاكاردا نییە.



## پەراوێز

1- Carnap, R., Von der Erkenntnistheorie zur Wissenschaftslogik in: Actualites Scientifiqus… actes du Congres Interna… du Philosophie… Paris 1931. Bd. I. S. 36.

2- Ferrari, M., Ueber die Urspruenge des Logischen Empirismus…. In: E. Rudolph – I. O. Stamatescu. (Hrsg.). Von der Philosophie zur Wissenschaft. Meiner 1997. S. 116.

٣- پاكتاوكردنی میتافیزیك — بە ئەڵمانی — ل٢٢٤ بەدواوە.

4- Carnap, R., Die Physikalische Sprache als Universal – Sprache der Wissenschaft. In: Erkenntnis. Bd 2. S. 441.

٥- رودۆلف یوهانس س. كارناپ ساڵی ١٨٩١ز لە رونسدۆرفی بارمن (ئێستا كە شاری ڤوپەرتال) لە هەرێمی نۆرد راین ڤێستڤالن — ئەڵمانیا لە دایك بووە. لە ساڵی ١٩١٠-١٩١٤ لە زانكۆی یینا فەلسەفە و ماتماتیك و فیزیكی خوێندوە. لەوەدەچێ ئەوساش وەك ئێستا پێویست بووە خوێندكار لە زانكۆكانی ئەڵمانیا سێ بابەت لە یەك كاتدا بخوێنێ، بابەتێكی سەرەكی و دووی لاوەكی. ساڵی ١٩٢١ لە لێكۆڵینەوەیەكدا بەناوی (جێگا) پلەی دكتۆری وەرگرتووە. چالاكی فەلسەفی و زانستی لە پراگ و ڤیەننا دەست پێ كردووە. یەكەم بەرهەمی كە بە دنیای ناساند *(بنیاتنانی مەنتیقی جیهان* ساڵی ١٩٢٨) بوو كە بەهۆیەوە پلەی پرۆفیسۆری پێ بەخشراوە. ئەندامێكی چالاكی كۆڕی ڤیەننا بووە. كە ناسیۆنال سۆسیالیستەكان نەمسایان گرت كۆڕەكەیان داخست و ناچار كرا وڵات بەجێ بهێڵێ و بەیەگجاریی كۆچی كرد بۆ ئەمەریكا و تا دواساتی ژیانی ١٩٧٠ز لەوێ مایەوە. فەلسەفەكەی وەك بەرهەمەكانی دەكرێ بەدوو بەشەوە، پێش كۆچكردنی بەزمانی ئەڵمانی و دوای كۆچی بۆ ئەمەریكا بە زمانی ئینگلیزی.





*سێنتاکسی مەنتیقی زمان* ١٩٣٤ بەرهەمێکی تری کارناپە. ئەوی لێرەدا مەبەستمانە فەلسەفەکەیەتی کە پێش کۆچی بو ئەمەریکا بە ئەڵمانی نووسیویەتی.

٦- ئەوی راست بێ ماوەیەکی زۆرە گرفتاری دەستی وشەی ئەڵمانی Erfahrung بەرامبەر بە وشەی عەرەبی (ئەل خیبرە) بووم. هەرچەندی کردم لە کوردیدا بەرامبەر بەم دوو وشەیە لە (شارەزایی) باشترم دەست نەکەوت، ئەگەرچی شارەزایی وەك ئەڵمانی و عەرەبییەکە فراوان و سەرتاپاگیر نییە. وەك من بۆی بچم شارەزا پتر پەیوەندی بە زانینی جێگاوە هەیە.

7- Konstitutions theorie der Begriffe. :بە ئەڵمانی

8- Carnap, R. Der Logische Aufbau der Welt. Hamburg 1974. S. 1.

٩- کارناپ: هەمان سەرچاوە ل-٢٠.

١٠- کارناپ، هەمان سەرچاوە. ل ٢٠٩-٢١٠.

١١- هەمان سەرچاوە ل-٣.

١٢- هەمان سەرچاوە ل-١٤٨.

13- Carnap, R., Logische Syntax der Sprache. Wien 1934. S. 2.

١٤- کارناپ، هەمان سەرچاوە. ل-١٠.

15- Horstmann, Hubert., Der Physikalismus als Modelfall Positivistischer Denkweise. Berlin 1973. S. 78-79.

١٦- کارناپ: بنیاتنانی مەنتیقی..... بە ئەڵمانی (ل-٢٢٤).

17- Carnap, R., Mein Weg in die Philosophie. Reclam 1993. S. 5 ff.

١٨- ئەو قسانەی من لێرەدا دەیانکەم نابێ وا لێك بدرێنەوە کە من پشتگیری قسە و بڕیارەکانی فۆیەرباخ ئەکەم. نەء من باسی بۆچوونی خۆم ئەکەم. ئەو شتانەی فۆیەرباخ کردوونی پتر ئاینەکانی تر دەگرنەوە.

١٩- کارناپ، هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل -١٣٠.



٢٠- لە لاهوتدا قەدەر و چارەنووس هەیە. مرۆڤ بەدەست خۆیەتی چارەنووسی خۆی دیاری بکات. بەڵام قەدەر شتێکە لە ناوچەوان دەنووسرێ و مرۆڤ لە بەرامبەریدا بێ دەسەلاتە.





# مەنتیقی کۆن و نوێ

*** رودۆلف کارناپ***

**١- مەنتیق وەک پەیڕەوێکی فەلسەفەکردن:**

زنجیرەی نوێی ئەم گۆڤارە[1]، کە بەم ژمارەیە دەست پێ دەکات، ئەو ئەرکە دەگرێتە ئەستۆی خۆی، پەیڕەوێکی نوێی زانستییانەی بیری فەلسەفە پەرەپێ بدات. دەکرێ بەکورتی ئەو پەیڕەوە باسکرێت و بوترێت: بریتییە لە شیکردنەوەی مەنتیقی ڕستە و چەمکەکانی زانستی ئەزمونیی. ئەم باسکردنە دوو خاڵی گرنگ دەردەخات کە ئەم پەیڕەوە لە پەیڕەوی کلاسیکی فەلسەفە جیا دەکاتەوە:

**یەکەم:**

ئەم چەشنە فەلسەفەکردنە توندوتۆڵ بەزانستی ئەزموونییەوە پەیوەستە و بەهۆیەوە پیادەکرێ، ئیتر بۆیە دان بەوەدا نانرێ کە فەلسەفە شان بەشان یاخود لە سەروو زانستە ئەزمونییەکانەوە پاوان و گۆڕەپانێکی تایبەتی زانینی هەیە.

**دووەم:**

ئەو ئەرکە روون دەکاتەوە کە لە چوارچێوەی زانستی ئەزموونیدا دەکەوێتە ئەستۆی فەلسەفە: روونکردنەوەی ڕستەکانی بەهۆی شیکردنەوەی مەنتیقیی، بەتایبەتی، توێ توێ کردنی ڕستەکان بۆ بەشە ڕستەکان (چەمکەکان)، واتە، هەنگاو بەهەنگاو گێڕانەوەی چەمکەکان بۆ سەر چەمکە بنەڕەتییەکان و گێڕانەوەی ڕستەکان بۆ سەر ڕستە بنچینەییەکان کە لێیانەوە کەوتوونەتەوە. لەم ئەرك دیاریکردنەدا ئەو بایەخە





دەردەکەوێ کە مەنتیق لە لێکۆڵینەوەی فەلسەفەییدا هەیەتی. مەنتیق وەك جاران تەنیا تاکە دیسپلینێکی فەلسەفە نەماوە بەڵکو دەکرێ بڵێین: مەنتیق پەیڕەوی فەلسەفەکردنە. لێرەدا ئێمە بە مانایەکی فراوان لە مەنتیق دەگەین کە مەنتیقی روخسارەکیی و رووت و مەنتیقی پراکتیکی یاخود تیۆری زانین دەگرێتەوە.

هیواو ئاواتی گۆڕینی چەمکە شیعرییەکانی میتافیزیك بە پەیڕەوێکی زانستی فەلسەفەکردن هەر لە ئاواتێکی ئاینییانە دەچوو ئەگەر هاتبایە تەنیا سیستەمی مەنتیقی کلاسیکییەکە وەك تاکە ئامرازێکی مەنتیقی لەبەردەست دابایە. ئەم جۆرە لە توانایدا نەبوو ئەو ئەرکە کە دەبوو پێی بسپێردرێ راپەڕێنی بەتایبەتی، پیت و پێزیی ناوەرۆك و وردیی و دەستبەکاریی روخسارەکی و کەڵك لێ وەرگیران و بەبڕشتیی و سوودیی تەکنیکی. مەنتیقی روخسارەکی پشت بە سیستەمی ئەرستۆتڵس و سەدەکانی ناوەڕاست دەبەستێ، ئەو سیستەمەی لە ڕێڕەو و پرۆسەی پەرەسەندنیدا زۆرکەم باش بوون و چاککردن و تەواوکردنی بەخۆیەوە دیوە.

راستە لە مەیدانی مەنتیقی پراکتیکی (زانستی پەیڕەو)دا چەندین لێکۆڵینەوەی جیا و تاکییانە و بلاوکراوەی تێروتەسەل و بایەخدار چاپ و بلاوکراونەتەوە. ئەمانە لە ناوەرۆکدا بابەتی بەپێزی بیر و بیرکردنەوەییان تیادابووە، بەڵام لەبارەی وردەکاریی چەمك دارشتن و قووڵبوونەوەو شیکردنەوەی ریشەگیرییدا تارادەیەك کاڵ و کرچیی و ساکارییان پێوە دەدیترێ. ئەمە سەرزنشتکردنی ئەم کار و بەرهەمانە نییە (بەتایبەتی ئەوانەی سەدەی رابووردو نووسرابوون)، چونکە رەوشی مەنتیقی پراکتیکی ئەوسا بەدەست کەموکوڕیی و نیوەچڵیی بنچینە روخسارییەکەوە گیرۆدەبووە.

داهێنان و دانانی ئامرازێکی بەتوانای نوێ لە جێی ئامرازە بێ کەڵکە کۆنەکە کاتێکی زۆری ویست. لەوانەیە بکرێ مرۆڤ گومان لەوە بکات کە ئەم

مەنتیقکارانە بە توانای تایبەتی خۆیان ئەم کارەیان بۆ کرابێ. خۆشبەختانە ئەم ئامرازە هەبوو، واتە مەنتیقە نوێیەکە کە زانایانی بیرکاریی (مەتماتیك) لەم پەنجا سالأنەی دواییدا پەرەیان پێ دابوو. ئەم پەرەپێدانە لەو گیروگرفتانە کەوتەوە کە لە چوارچێوەی بیرکاریدا سەریان هەڵدابوو. ئەو کاتە بیر لە پیادەکردنێکی گشتی سودبەخش و گرنگی فەلسەفەیی ئەم ئامرازە نوێیە نەکرابۆوە. بگرە زۆربەی زۆری فەیلەسووفەکان تا ئێستاش شارەزاییەکی کەمییان لەبارەیەوە هەیە و لە کار و چالاکییەکانیاندا بە کەمیی سوودیان لێ وەرگرتووە. سڵ و پارێزیی ئەوان لەو مەنتیقە نوێیە و ئەو ترسەی لێیان هەبوو شتێکی دیار و بەرچاون. بێگومان کالاٚ روخساریی ماتماتیك زۆر کەسی ترساندووە. ئەوی راست بێ لەپشت ئەم هەڵوێستەوە جۆرە دژە هەستێکی زگماکی هەیە. خۆ ئەگەر ئەمەیان بۆ دەربکەوتبایە -ئەگەر چی ئەمە بۆ زۆربەی لایەنگیرانی مەنتیقە نوێیەکەش روون نییە- ئەوا لەو مەنتیقە نوێیەدا ئەو خاڵەیان دەکەوتە بەرچاو دەست کە پاکانە بۆ دەستبەرداربوون لە فەلسەفەی کۆن دەکات. فەلسەفە هەمووی بەمانا کۆنەکەی جا ئەوەبێ تایبەتە بە ئەفلاتوون، تۆمای ئەکوین، کانت، شیلنگ یاخود هیگڵ یان ئەوانەی بە «میتافیزیکی نوێ بوون» یاخود «فەلسەفەی زانستی گیان»ی دادەنێن، لەبەردەم بڕیاری سەخت و راستەقینەی مەنتیقی نوێدا خۆیان ساغ دەکەنەوە، نەك هەر لە ناوەرۆکدا هەڵەن بەڵکو وەك مەنتیق بڕناکەن و خۆیان ناگرن و بگرە بێ مانان.

## ٢- مەنتیقە نوێیەکە:

مەنتیقی نوێ لەدەیەی دوایی سەدەی رابوردوودا، پشت ئەستور بە بیرەکانی لایبنیتس و بەسوود وەرگرتن لەو کۆششەی لەپێشەوە (دی مۆرگان ١٨٤٨ز، جۆرج



بوول ١٨٥٤ز) کردیان و هەنگاوی دانانی مەنتیقێکی فراوانی نوێ کە لەلایەن فرێگە و پیانۆ و شرۆدەرەوە هاوێژراون، پەیدابووە، (بڕوانە سەرچاوەکان لە کۆتایی ئەم باسەدا. وایتهێد و رەسڵ سوودیان لەم بەرهەمانەی پێش خۆیان وەرگرت و شاکارێکی گەورەی مەنتیقی نوێیان داهێنا «بنەڕەتەکانی بیرکاری» (١٩١٠-١٩١٣). هەموو ئەو بەرهەمانەی تر کە دەرچوون پشتیان بەم بەرهەمە بەستووە و هەوڵیان داوە تەواوتری بکەن یاخود بەجۆرێکی تر دایڕێژنەوە. (لەم بوارەدا چەند ناوێك دەهێنین: رێبازی گۆتنگن: هیلبەرت، ئاکەرمان، بیرنایز، بێهمان.. هتد. رێبازی ڤارشەو رابەرەکانی وەك : چڤیستێك، لێسنیڤسکی، تارسکی... هتد. ڤتگنشتاین و رامزی هەڤالی و، لویس و فرێنکل).

گرنگترین هاندەر کە بووە مایەی پەرەپێدانی مەنتیقە نوێیەکە ئەو پێداویستییە ناچارییەی سەرلەنوێ پێیداچوونەوەی بنچینەکانی بیرکاریی (ماتماتیك) بوو. لەسەردەمی لایبنیتس و نیوتنەوە بیرکاریی گۆڕان و پەرەسەندنێکی گەورەی بەخۆیەوە دی و زانیاری نوێی زۆر و زەبەندی بەدەست هێنا. کەچی زامنکردنی بنچینەکان بەپێی ئەم گەشەکردنە خێرایەی بنیاتەکە هەنگاوی نەهاویشتووە. بۆیە پێش نزیکەی سەد ساڵێك بۆ روونکردنەوەیەکی چەمکە بنەڕەتییەکان هەوڵێکی جوامێرانە درا. ئەم کۆششانە لە زۆر بواردا سەرکەوتوو بوون. زانایانی بیرکاریی توانیان چەندین چەمکی گرنگ بە وردی پێناسە و روون بکەنەوە وەك: رادە، ژمارەی داڕژاو و ژمارەی لێکدراو. ئەم چەمکانە بۆ ماوەیەکی درێژ، بەبێ ئەوەی پێناسەی تەواو کرابن سوودبەخش و سەرکەوتووانە ئاسایی پیادە و بەکارهێنراون. نەك بەهۆی روونی و رەوانی چەمکەکانەوە بەڵکو لە سایەی توانای پتەو گومان لێ نەکراوی زانایانی ماتماتیکەوە توانرا ساغ ببێتەوە کە کەموکوڕیی لە داڕشتنی چەمکەکاندا هیچ جۆرە زیانێکی بیرکاریی لێ نەکەوتۆتەوە.





هەوڵ و کۆششی ((لێدانی بناغەی قوول و پتەو)) هەنگاو ئاسایی بەرەوپێش چوون. تەقەللاکە تەنیا بەوە نەوەستا چەمکە جۆر و جیاوازەکانی شیکاریی (ماتماتیك) بباتەوە سەر چەمکەکانی ژمارە کە بە چەمکە بنەڕەتییەکانی بیرکاریی دادەنرێن، بەڵکو ئەو ئەرکە خرایە ئەستۆ، چەمکەکانی ژمارە بە روونکردنەوەیەکی مەنتیقییانە روونبکرێنەوە. ئەم لێکۆڵینەوانەی بنەڕەتە مەنتیقییەکانی ژمێرکاریی و ئامانجی شیکردنەوەی مەنتیقییانەی ژمارە لەگەڵیاندا، پێویستییەکی ناچارییان بە بوونی سیستەمێکی پتەو وردو سەرتاپاگیر و بە بڕشت و تەواو و بەتوانا هەبوو. ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە هاندەرێکی بەگوڕ و تەوژمی پەرەسەندنی ئەم مەنتیقە نوێیە بوون، پیانۆ، فرێگە، وایتهێد، رەسڵ و هیلبەرت لەبەرهەم و نووسینە مەنتیقییەکانیاندا بە پلەی یەکەم ئەم ئەرکەیان گرتە ئەستۆ و هەوڵی پیادەکردنیانداوە.

پێویستیی جارێکی تر بنیاتنانەوەی نوێ مەنتیق پتر بوو بە شتێکی ناچاریی ئەو کاتەی هەست بەبوونی چەندین ناکۆکی Antinomien لەنێو بینای بیرکاریدا کرا. ئەو ناکۆکییانەی دەرکەوتن سروشتێکی گشتی مەنتیقییان هەبوو هەر بۆیە بەهۆی دارشتنەوەیەکی بنچینەیی مەنتیقەوە چارەسەر دەکرێن.

لێرە بەدواوە هەوڵ دەدەم چەند تایبەتییەکی گرنگی ئەم مەنتیقە نوێیە بخەمە بەرچاو کە لە مەنتیقی کۆن جیای ئەکاتەوە و بەهۆیانەوە بایەخێکی گشتی زانستییانەی پێ بڕاوە.

لە سەرەتادا سەرنجێکی ئەو بەرگ و کاڵا سیمبۆڵییە دەدەین کە مەنتیقی نوێ تیایاندا دەردەکەوێ، ئینجا چەند تێبینیەك دەربارەی بە پێزبوونی ناوەرۆکی مەنتیقە نوێیەکە دەخەینە بەرچاو، ئەو بە پێزبوونەی لە بەکارهێنانی بیرۆکەی ((پەیوەندییەکان)) لە جیاتی بیرۆکەی تەسك و تەنگەبەری ((بار))[2] کەوتۆتەوە. سەرەڕای ئەمانە بە کورتی و پوختی روون دەکرێتەوە، چۆن ناکۆکییە ناوهێنراوەکان



بەهۆی ناسراو بە تیۆری تایپەکانەوە (جۆرەکانەوە) چارەسەر دەکرێن. دوای باسکردنی ئەم خاڵانەی کە لە چوارچێوەی مەنتیق خۆیدا بایەخێکی سەرکییان هەیە، هەندێك خاڵی تر لەبەرچاو دەگرین کە بەگشتی بایەخی زانستییان هەیە:

شیاوەکی ئەوەی ماتماتیك لە مەنتیقەوە پەیدابووە و کەوتۆتەوە، ئەو شیاوەکییەی بۆ فەلسەفە بایەخێکی زۆری هەیە، لەوەدا کە کارەکتەری جەوهەریی ڕستە مەنتیقییەکان وەك تاوتۆلۆجی (هەمانگوتن) روون دەکاتەوە، هەروەها شیکردنەوەی چەمك کە دەبێتە مایەی جۆرە یەکبونێکی زانست، لە دواییدا پووچەڵکردنی میتافیزیك بەهۆی شیکردنەوەی مەنتیقییانەوە باس ئەکەم.

### ٣- پەیڕەوە سیمبۆڵییەکە:

ئەگەر مرۆڤ لێکۆڵینەوەیەکی نوێ مەنتیقی بکەوێتە بەردەست یەکسەر ئەو لایەنەی سەرنجی ڕادەکێشێ و دیار دێتە بەرچاوی ئەو پەیڕەوە و فۆرمێلە سیمبۆلییانەیە تیایدا بەکارهاتوون و لەوانە دەچن لە بیرکاریدا بەکاردێن. ئەم سیمبۆلانە لەبنەڕەتدا پشت ئەستوور بە بیرکاریی داهێنراون، ئینجا لێیانەوە فۆرمێکی گونجاو تایبەت بە ئامانجێکی دیاریکراو کەوتۆتەوە. لە بیرکاریدا بایەخی پەیڕەوی باسکردنی سیمبۆلی لە بەرابەر ئەوەی لە زمانی ئاساییدا باوە، بە ئاشکرا دەردەکەوێ ڕستەکە یاخود کێشەکە چەند وردو روون دەبێ، بۆ نموونە، لەجیاتی ئەوەی بنووسین: ژمارەیەك لە ژمارەیەکی دووەم بدرێ، هەمان ئەنجام دەکەوێتەوە و هەروەك ئەمەوایە: ژمارەیەکی دووەم لە یەکەم بدرێ.. لە جیاتی ئەمە بنووسرێ:

بۆ پیتی: "X ، Y دەکرێ: X . ٣ = Y . X" بێ یاخود پوختتر ئەگەر سیمبۆلی مەنتیق بەکاربهێنین: " (X، Y). X . ٣= Y . X".





پیادەکردنی پەیڕەوی سیمبۆلی لە مەنتیقدا ئەنجامە کەوتووەکانی ورد و گرد کردوە و بەبێ ئەم پیادەکردنە ئەم ئەنجامەمان دەستگیر نەدەبوون. ئەنجامگیرییەکە لە پرۆسەیەکی ژمێریاری فۆرمێلەکانەوە دەکەوێتەوە (ژمێریاری، ژمێریاری پرۆپۆزیشن و ژمێریاری فەنکشنەکان). ناوەرۆك بەپێزیی ڕێنمایی پرۆسەی ئەنجامگیرییەکە دەکات. بەلاّم بۆخۆی نابێت بە بەشێك لە ئەنجامگیرییەکە. ئەم پەیڕەوە دەستەبەریی ئەوە دەبێ کە هیچ گریمانەیەکی هەست پێ نەکراو دزە نەکاتە ناو پرۆسەی ئەنجامگیرییەکەوە. ئەمەش کارێکە لە کاتی پیادەکردن و بەکارهێنرانی پەیڕەوی زمانی ئاساییدا وا بە ئاسانی خۆی لێ ناپارێزدرێ.

ئەم چەشنە وردیی و گردییەی ئەنجامگیریی بۆ بەلّگەنەویستیی هەر مەیدانێك بۆ نموونە مەیدانی ئەندازە زۆر گرنگ و بە بایەخە. لە بواری پەرەسەندنی مێژووییدا زۆر نموونەی ئەنجامگیریی نیوەچڵ وەك هەولّی جیاجیای خستنەوەی بەلّگەنەویستیی تەریبی لە بەلّگەنەویستەکانی تری ئەندازەی ئیکلیدس ناسراون و دەبینرێن. لێرەدا ڕستەیەك وەك هاوکێشە و بەرامبەری بەلّگەنەویستە تەریبییەکە لەکاری لێ وەرگرتن و لێ کەوتنەکەدا بەکارهێنراوە. هەروەها وردیی و بێ گەردیی چۆن بۆ داڕشتنی ڕستەکان بایەخدارە ئاوەها بۆ دانانی چەمك و بۆچوونەکانیش گرنگە. شیکردنەوە بەهۆی ئامرازەکانی مەنتیقە نوێیەکەوە دەری خست زۆر چەمکی فەلسەفە ورد و گرد و بێ گەرد نین. هەندێکیان دەبێ بەجۆرێکی تر دابڕێژرێنەوە و ئەوانی تریان وەك پووچ و بێ واتا دوور بخرێنەوە. (بڕوانە بڕگە -٩-). لەم سەردەمەماندا هەمیشە پتر روون دەبێتەوە کە تیۆری زانین، کە لە مەنتیقی پراکتیکی بەولاوەتر نییە، ناتوانێ دەستبەرداری مەنتیقی سیمبۆلی ببێ هەروەك فیزیك ناتوانی دەست لە بیرکاری بەردات.



### ٤- مەنتیقی پەیوەندییەکان

مەنتیقە نوێیەکە هەر بەوە لە کۆنەکە جیا نابێتە کە شێوەی ئامرازی باسکردنەکەی جیایە، بەلّکو بەوەشدا کە ناوەرۆك و بوار و مەیدانەکەی گەلێك فراوان و بەرین و بەپێزترە. گرنگترینی ئەم بوار و مەیدانانە تیۆری ڕستە (پرۆپۆزیشنە) پەیوەندییەکان و تیۆری هەمە چەشنەیی ڕستە فەنکشنیەکانن. تاکە شێوەی ڕستەکان (بڕیار — حوکمدان) لە مەنتیقی کۆندا شێوەی بار بووە: «سوقرات مرۆڤێکە». «هەموو یاخود: هەندێك لە یۆنانییەکان مرۆڤن». لێرەدا چەمکی ناو چەمکێکی باری دەدرێتی، یاخود ئاوەلّناوێکی دەخرێتە سەر. لەسەردەمی خۆیدا لایبنیتس ئەو پێداویستییەی دووپات کردەوە و پێی لەسەر داگرت کە دەبێ مەنتیق ڕستە پەیوەندییەکانیش بگرێتە خۆی. لە ڕستەیەکی پەیوەندیی وەك ئەمەدا: (ب گەورەترە لە ت) دەبینین کە پەیوەندییەك دوو شت یاخود پتر بەیەکەوە دەبەستێ (یاخود دەکرێ بوترێ: چەندین چەمکە ناو بەیەکەوە گرێ دەدات). مەنتیقی نوێ نەخشەی تیۆری پەیوەندییەکانی لایبنیتسی فراوانتر کرد. مەنتیقی کۆن ڕستە پەیوەندییەکانی بە ڕستەی بار فۆرمی دادەنا. ئەمە بووە مایەی ئەوەی هەندێك ئەنجامگیریی نێو ڕستە پەیوەندییەکان، کە زانست ناتوانێ دەستبەرداریان ببێ، لە کردن نەیەن. لە توانادا هەیە بۆ نموونە مرۆڤ ئەم ڕستەیە بەم جۆرە لێك بداتەوە: (ب) گەورەترە لە (ت)، بڵێ: ناو (ب) باری — لە (ت) گەورەتری-ی پێدراوە. لێرەدا ئەم بارە جۆرە یەکەیەك پێك دەهێنێ کە ناکرێ (ب) بەهۆی هیچ بنچینەیەکی ئەنجامگیریی دووره پەرێز بکرێت. بۆیە لە توانادا نییە لە ڕستەی پێشوەوە ئەم ڕستەیە بکەوێتەوە: (-ت- بچوکترە لە -ب-).

ئەم ئەنجامگیرییە لە مەنتیقی نوێدا بەم جۆرە دەکەوێتەوە:





پەیوەندی «بچوکترە لە» وەك پێچەوانەی «گەورەترە» پێناسە دەکرێ. کەوابوو ئەنجامگیرییە ناوبراوەکە پشت بەم ڕستە گشتییە دەبەستێ: ئەگەر جۆرە پەیوەندییەك (س، ش) بەیەکەوە گرێ بدات ئەوا پێچەوانەکەی (ش، س) بەیەکەوە دەبەستێتەوە. نموونەیەکی تری ڕستەیەك (پرۆپۆزیشن) کە لە مەنتیقی کۆندا ناسەلمێنرێ و ساغ ناکرێتەوە:

«ئەگەر سەرکەوتوویەك هەبێ، ئەوا ژێرکەوتوویەکیش هەیە» لە مەنتیقی نوێدا ئەمە لەم ڕستە مەنتیقییە دەکەوێتەوە:

ئەگەر پەیوەندییەك لایەنێکی سەرەتای هەبێ، ئەوا لایەنێکی کۆتاییشی هەیە.

ڕستە پەیوەندییەکان بەتایبەتی بۆ زانستە بیرکارییەکان گرنگ و بەبایەخن و پێویستن. وەك نموونە چەمکی ئەندازەیی پەیوەندی سێ قۆڵیی (لە نێوان) دێنینەوە (لەسەر هێڵێکی ڕاست). ئەم بەڵگەنەویستەی ئەندازە: «ب کەوتۆتە نێوان ت، ج» کەوابوو «ب دەکەوێتە نێوان ج، ت» هەروەها «ب کەوتۆتە نێوان ت،ج» ئەوا «ت ناکەوێتە نێوان ج،ب» دەکرێ تەنیا لە مەنتیقی نوێدا بەوردیی دەربڕدرێ.

لە بۆچوونی مەنتیقی بارییەوە، لە بەشی یەکەمدا تەنیا ئەم بارانەمان دەبێ: (کەوتنە نێوان ت، ج) هەروەها (کەوتنە نێوان ج، ت). ئەگەر ئەمانە توێ توێ نەکرێن ناتوانرێ روون بکرێتەوە چۆن و بە چ جۆرێك باری دووەم بەهۆی فۆرم گۆڕینەوە لە یەکەم دەکەوێتەوە. ئەگەر هەردوو بابەت (ت، ج) لە بارەکە دابڕین ئەوا ئەم ڕستەیە (ب — کەوتۆتە نێوان: ت، ج) تەنیا یەك بابەت پێناسە ناکات بەڵکو سێ بابەت، بۆیە ئەو پەیوەندییە ڕستەییەکی سێ قۆڵییە.

ئەو پەیوەندییانەی ناویان هات «گەورەتر» و «لە نێوان» لەو جۆرەن ناکرێ بە ئارەزووی خۆمان وەك ئاڵقەیەك شوێنەکەیان بگۆڕین و بیانخەینە ناو زنجیرەیەکی ترەوە. دەستنیشانکردنی هەرجۆرە ڕێکوپێکی و زنجیرەی بەدوا یەکتریدا هاتن



لەبنەڕەتدا پشت بە بەکارهێنانی ئەم جۆرە پەیوەندییانە دەبەستێ. لە تاقمە کەسێکدا ئەگەر هەردوو کەس یاخود جوتێکی بزانرێ کامیان لەوانی تر درێژترن ئەوا دەتوانرێ زنجیرەی ئەو کەسانە بە ڕێکوپێکی ڕێکبخرێ. هەروەها دەکرێ بوترێ، ئەم کارە بە یارمەتی دیاریکردنی بارەکییەوە لە کردن دێت، بەتایبەتی ئەگەر هەر یەکێك لەو کەسانە جۆرە ژمارەیەکی پێوانی بۆ دابنرێ. بەڵام لێرەدا دەبێ گریمانەی ئەوەش بکەین، سەبارەت بە هەر ژمارە جوتێکی ئەم تاقمە، کامیان لە کامیان درێژترن. بەبێ بەکارهێنانی پەیوەندی ڕێکخەرەکی دانانی ئەم جۆرە زنجیرەیە لە کردن نایەت. لەمەوە ساغ دەبێتەوە کە هەموو ئەو زانستانەی بابەتەکانیان ڕێکوپێکیی و زنجیرەی بەدوایەکتریدا هاتنن، ناتوانن دەستبەرداری تیۆری پەیوەندی بن: ژمێریاریی (زنجیرەی ژمارە). ئەندازە (زنجیرەی خاڵ) فیزیك (زنجیرەی پێوانە: هی جێگا و کات و قەوارە جۆربەجۆرەکان).

پابەندبوون بە ڕستە بارییەکانەوە و پەیڕەوکردنیان تەنیا لە دەرەوەی مەیدانی مەنتیقیشدا بۆتە مایەی کەوتنەوەی گەلێك ئەنجامی لەبار. لەوانەیە ڕەسڵ لەسەر هەق بێ کە چەند هەڵە و چەوتییەکی میتافیزیکی بە هەڵەی مەنتیقی زانیوە. خۆ ئەگەر هەر ڕستەیەك بارێك بداتە پاڵ ناوێك یاخود بداتە پاڵ بکەرێك ئەوا دەبێ بەراستی تەنیا یەك بکەر هەبێ ئەویش ڕەهایە (موتڵەقە). هەروەها هەر فاکتە دەبێ بابەتەکەی وابێ کە ئەو ڕەهایە سیفەتی دیاریکراوی هەیە و هەبێ. دوور نییە بشێ بەهەمان ڕێگا میتافیزیکی جەوهەر هەر لەم هەڵەیەوە پەیدابووبێ.

بەدڵنیاییەوە دەڵێین، ئەو پابەندبوونەی لەمەوبەر ناوی هێنرا بۆ نموونە ئەو بۆچوونەی ماددەی بە گەوهەر (جەوهەر) داناوە کارێکی درێژخایەنی نالەباری لە فیزیکدا کردووە. هەروەها دەشێ وای دابنێین کە چەمکی جێگای لە رادەبەردەر و بێ سنور (ڕەها) هەر لە هەمان هەڵەی مەنتیقەوە کەوتبێتەوە. چونکە فۆرمی بنچینەیی ڕستەیەك کە ڕستەی باری جێگایەکی بێت کاتێك دەبێ ئەگەر بێتو





جێگای لەشێك دیاری بکرێ. لایبنیتس بە هەبوونی پەیوەندییە ڕستەییەکانی زانیوە بۆیە توانیویەتی بۆچوونێکی ڕاست دەربارەی جێگا گەڵاڵە بکات: نەك جێگای لەشێك بۆخۆی بەتەنیا، بەڵکو ئەو پەیوەندییە جێگاییانەی خۆی لەگەڵ لەشەکانی تر پێکەوە دەبەستێتەوە ڕاستی و پوختەی بابەتەکە پێك ئەهێنن. ئەم بۆچوونە خۆی لەسەر بنچینەی تیۆری زانین ساغ کردەوە:

نەك جێگا لە خۆیدا، بەڵکو تەنیا پەیوەندییە جێگاییەکان دەکرێ دەستنیشان بکرێن. ئەو خەباتەی لایەنگرانی نیوتن لەپێناو جێگیرکردنی بۆچوونی ڕێژەیی جێگا دژی بۆچوونی ڕەهای جێگا کردیان وەك ئەو کۆششەی بۆ چەسپاندنی مەنتیقی نوێ کرا بە کەمیی سەرکەوتنی پێ بڕاوە. دوای ۲۰۰ ساڵ بیروبۆچوونەکانی دەربارەی هەردوو بابەتەکە جارێکی تر هاتنەوە مەیدان و پیادە و جێگیرکران: لە مەنتیقدا و لە چوارچێوەی تیۆری پەیوەندییەکاندا ئەمە جێبەجێ کرا (دی مۆرگان ۱۸۵۸، پێرس ۱۸۷۰)، لە فیزیکدا لەلایەن تیۆری ڕێژەییەوە پیادەکرا (زەمینە خۆشکردنەکە لەلایەن ماخ بوو ساڵی ۱۸۸۳ ئینجا ئاینشتاین ۱۹۰۵).

## ٥- ناکۆکییە مەنتیقییەکان:

لە کۆتایی سەدەی ڕابوردوودا چەندین ناکۆکی سەیر (Paradoxien) لەنێو دیسیپلینی تیۆری کۆیەکانی (Mengen Lehre) ماتماتیك بە دەرکەوتن. لێکۆڵینەوەکان دەستبەجێ دەریان خست ئەم ناکۆکییانە سروشتی بیرکارییان نییە بەڵکو چەندین ناکۆکییەکی گشتی مەنتیقین؛ ئەوەی کە ناکۆکییە مەنتیقییەکانیان پێ دەوترێ. مەنتیقی نوێ لە قۆناغی پەرەسەندنی ئەوساتەیدا لە توانایدا نەبوو ئەم ناکۆکییانە پووچەڵ بکاتەوە و بەلایاندا بخات ئەمەش کەموکوڕییەك بوو، کە مەنتیقی نوێ و کۆنی بەیەکەوە کۆدەکردەوە و ناوکۆیی بوو لەنێو هەردووکیاندا. ئەم کەموکوڕییە هاندەرێکی لە بنەڕەتەوە داڕشتنەوەی نوێ سیستەمی مەنتیق



بوو. ڕەسڵ توانی بەهۆی تیۆری تیپەکانەوە (Typentheorie) ئەم ناکۆکییانە پووچەڵ بکاتەوە. ئەمەش بووە هۆی گەورەترکردنی کەلەبەری نێوان مەنتیقی کۆن و نوێ. مەنتیقی کۆن تەنیا ناوەڕۆکەکەی لاواز و بێ پێز نییە بەڵکو بەهۆی ئەو ناکۆکییانەی تیایدان و لانەبراون بایەخێکی ئەوتۆی نییە. (زۆربەی هەرەزۆری کتێبەکانی خوێندنی مەنتیق لەم بارەیەوە بێ ئاگان).

با سەرنجی نموونەیەکی سادەی ناکۆکی بدەین (بەپێی پەیڕەوی ڕەسڵ). چەمکێك دەکرێ وەك بارەکی دابنرێ ئەگەر خۆیشی بگرێتەوە. بۆ نموونە چەمکی «ڕووت — ئەبستراکت» خۆیشی ڕووتە. چەمکێك وەك نابارەکی دادەنرێ ئەگەر خۆی نەگرێتەوە بۆ نموونە چەمکی «چاکەخواز» چاك و خێرخواز نییە. بەپێی بنەڕەتی بێ مام ناوەندی چەمکی «نابارەکی» دەبێ بارەکی یاخود نابارەکی بێت و ڕێتێچوونی سێیەم یاخود مام ناوەند کە لەم دووانە بەدەربێت ناگونجێ. وای دادەنێین چەمکەکە بارەکییە: بەپێی پێناسەکەمان بۆ «بارەکی» دەبێ بەسەرخۆیدا بگونجێ و خۆیشی بگرێتەوە، کەوابوو ئەو چەمکە نابارەکییە چونکە چەمکە بنەڕەتییەکە خۆی نابارەکییە.

ئێستاکە وای دائەنێین کە چەمکی نابارەکی، نابارەکییە کەوابێ دەبێ ئەم چەمکە خودی خۆی بگرێتەوە چونکە بەپێی پێناسەکە دەبێ وابێ، ئیتر دەبێ ئەم چەمکە بەم پێیە بارەکی بێت. هەردوو گریمانەکە ئیتر ناتەبا و ناکۆکن. زنجیرە ناتەباییەکی دووررودرێژی وەك ئەمانە هەیە.

پوختەی تیۆری تیپەکان بەم جۆرەیە: هەموو چەمکەکان، واتە سیفەت و پەیوەندییەکان بەپێی پلە دابەش دەبن بۆ ئاسانکردنی بابەتەکە، لێرەدا باسی سیفەتەکان دەکەین: لەپێشدا ئەم جیاوازییە پیادە دەکەین: «تاکەکان» واتە ئەو بابەتانەی کە سیفەت نین (پلەی سفر). سیفەتەکانی تاکەکان (پلەی یەکەم). سیفەتەکانی سیفەتی تاکەکان (پلە یاخود ئاستی دووەم) هتد...





بۆ نموونە، لەشەکان بە تاکەکان دادەنێین، ئیتر، چوارگۆشە، سوور، سیفەتی ئاستی یەکەم پێك دێنن. سیفەتە جێگاییەکان، ڕەنگەکان، سیفەتی ئاستی دووەمن.

تیۆری تیپەکان دەڵێ: سیفەتێکی ئاستی یەکەم دەکرێ تاکەکان بگرێتەوە یاخود نەگرێتەوە، بەلاّم ئەم سیفەتە، بەپێچەوانەوە، بەهیچ جۆرێك سیفەتەکانی ئاستی یەکەم و بالاّتر ناگرێتەوە.

سیفەتێکی ئاستی (پلە)ی دووەم دەکرێ تەنیا سیفەتەکانی پلەی یەکەم بگرێتەوە یاخود نەگرێتەوە. بەلاّم تاکەکان یاخود سیفەتەکانی پلەی دووەم و بەرزتر ناگرێتەوە. هتد. بۆ نموونە: ب، ت چەند لەشێکن. ئیتر ئەم ڕستانە: (ب چوارگۆشەیەکە) و (ت سوورە) ڕاستن یاخود درۆن. لەهەردوو باردا پڕ مانان. بەلاّم ئەم ڕستانە: (چوارگۆشە سیفەتێکی جێگاییە) و (سور ڕەنگە) ڕاستن. بەپێچەوانەوە: ئەم ڕستە وشانە: (ب سیفەتێکی جێگاییە) و (چوارگۆشە سوورە)، (ڕەنگ سیفەتێکی جێگاییە) نە ڕاستن و نە درۆ بەڵکو بێ مانا و ساختە ڕستەن. دەکرێ ئەم جۆرە ساختە ڕستانە دوور بخرێنەوە ئەگەر بێتو: چەمکێك یاخود (سیفەتێك) لە ئاستی (ن)دا تەنیا لە ئاستی (ن — ١) پیادە بکرێت یاخود بگرێتەوە. لەمەوە ئەنجامێکی گرنگ دەکەوێتەوە: ئەو گریمانانەی دەڵێن: (سیفەتێکی تایبەتی خۆی دەگرێتەوە یاخود خۆی ناگرێتەوە) نە دەکرێ ڕاست بن، نە درۆ بن بەڵکو هەمیشە بێ مانان.

ئەگەر بنەرەتەکانی تیۆری تیپەکان پەیرەو ڕەچاوبکرێن بە ئاسانی دەردەکەوێ کە ئەو ناکۆکی و ناتەباییانەی بە نا بارەکیی ناودەبرێن پەیدا نابن و ناکەونەوە. بۆیە پێناسە ناوبراوەکانی «بارەکی» و «نابارەکی» لە دانان نایەن چونکە بێ مانان. بەم پێیەوە بەهەمان شێواز ئەو ناکۆکییانەی لێرەدا باس نەکراون دەکرێ بە یارمەتی تیۆری تیپەکان پووچەڵ بکرێن و بخرێنە لاوە.



### ٦- بیرکاری وەك لقێکی مەنتیق:

شیکردنەوەی مەنتیقیی زانستی ژمێریاری — وەك باسکرا، ئامانجێك بووە لە ئامانجەکانی مەنتیقی نوێ. فرێگە کاتی خۆی بەو ئەنجامە گەیشت کە دەبێ بیرکاری وەك لقێکی مەنتیق دابنرێ. ئەم بۆچوونە لەلایەن وایتهێد و ڕەسڵ بەشێوازێکی سیستەماتیکی ساغ و پشتڕاست کرایەوە. دەرکەوت، لە ئەنجامی ئەمەدا، هەر چەمکێکی بیرکاریی دەکرێ لە چەمکە بنەڕەتییەکانی مەنتیقەوە بکەونەوە و وەربگیرێن و هەموو کێشە و ڕستەیەکی بیرکاریی (ئەگەر بێتو لەو بوار و مەیدانە شیاوەکییانەی بەبیردا دێن و، قەوارەکەیان هەرچۆنێك بێت، بڕ بکەن و بەکاربێن) دەکرێ لە ڕستە بنەڕەتیەکانی مەنتیقەوە وەربگیرێن و بکەونەوە.

گرنگترین چەمکەکانی مەنتیقی نوێ (ئەوانەی دەکرێ تارادەیەك بگەڕێنرێنەوە سەر یەکتریی) ئەمانەی خوارەوەن:

١- نەفی «نەء، نا».

٢- بەیەکەوە بەستنەوەی مەنتیقییانەی دوو ڕستە: وە، یاخود، ئەگەر — ئەوا.

٣- هەریەکێك (یاخود — هەموو). هەیە.

٤- خۆیەکیی (وەك خۆی، وەك یەك).

لە کران هاتنی کەوتنەوە و وەرگێرانی چەمکە ژمێرییارییەکان بە نموونەیەکی سادە ڕوون دەکەینەوە: نموونەی ژمارە دوو وەك ژمارەیەکی بنەڕەتیی و سەرەکیی (کاردینال) واتە وەك ژمارەیەکی چەمکێك. ئێمە بەم شێوەیە پێناسەکە دەکەین: ژمارەی چەمکی ف دووە. ماناکەی ئەمە دەبێ بەم جۆرە بێت: یەك ك هەیە و یەك ی هەیە بەو شێوازەی: ك وەك ی نییە، ك دەچێتە ژێر ف، ی دەچێتە ژێر ف، هەروەها هەموو -ز- یێك دەگرێتەوە ئەگەر ز بچێتە ژێر ف، کەوابوو ز لەگەڵ ك وەك یەکن یاخود وەك ی وایە.

دەبینین لە پێناسەکردنی ژمارە «دوو»دا تەنیا چەمکە ناوبراوە مەنتیقیەکان بەکارهێنران. ئەو شێوازە وردەکارییە تەنیا بە ڕێگای دەربڕینی سیمبۆلییانەوە دەبێت.





به هه‌مان شێواز ده‌کرێ ژماره سروشتییه‌کان پێناسه و وه‌ربگیرێن و بکه‌ونه‌وه. له‌مه‌ش به‌ولاتر ژماره‌ی پۆزه‌تیڤ و نێگه‌تیڤ و شکاوه و ژماره‌ی ریال و ژماره‌ی کۆمپلێکس و له کۆتاییدا چه‌مکه‌کانی شیکردنه‌وه هه‌مان شت ده‌یانگرێته‌وه وه‌ك: رادده Limes، له یه‌ك نزیکیی و ژمێریاری جێکاریی و ته‌واوکاریی به‌رده‌وامن.

له‌به‌رئه‌وه‌ی هه‌موو چه‌مکێکی بیرکاریی له چه‌مکه بنه‌ره‌تییه‌کانی مه‌نتیقه‌وه که‌وتوونه‌ته‌وه، ده‌کرێ هه‌موو ڕسته‌یه‌کی بیرکاریی بۆ ڕسته‌یه‌ك ده‌رباره‌ی چه‌مکه مه‌نتیقییه‌کان وه‌ربگێڕدرێ، ئه‌م جۆره وه‌رگێڕانه (به‌پێی چه‌ند مه‌رجێك، وه‌ك ڕوونکرایه‌وه) ده‌کرێ له ڕسته بنه‌ڕه‌تییه‌کانی مه‌نتیق وه‌ك ئه‌نجامێك بکه‌وێته‌وه. با ئه‌م ڕسته‌یه‌ی ژمێرکاری وه‌ك نموونه‌یه‌ك بهێنینه‌وه: ١+١=٢ وه‌رگێڕانی بۆ سه‌ر ڕسته‌یه‌کی مه‌نتیقی به‌م جۆره ده‌بێ:

ئه‌گه‌ر چه‌مکێك ف ژماره -١-ی پێ بدرێ و چه‌مکێك گ ژماره‌ی -١-ی هه‌بێ، ف، گ به‌یه‌که‌وه نه‌گونجێن و یه‌کنه‌گرن و چه‌مکی ح بریتی بێ له یه‌کگرتن و (به‌یه‌که‌وه گرێدانی) ف، ك، ئه‌وا ح ژماره‌ی -٢- ده‌بێت. ئه‌م جۆره وه‌رگێڕانه ڕسته‌یه‌کی مه‌نتیقی چه‌مکه‌کان (تیۆری ڕسته فه‌نکشنه‌کان) نیشان ئه‌دات، ئه‌و ڕسته‌یه‌ی ده‌کرێ له ڕسته بنچینه‌ییه‌کانی مه‌نتیقه‌وه بکه‌وێته‌وه. به‌هه‌مان شێواز ده‌کرێ ڕسته‌کانی ژمێریاریی و شیکاریی (ئه‌وه‌نده‌ی به‌گشتی بڕ ئه‌که‌ن و راستن به‌مانا فراوانیه‌که‌وه) وه‌ك چه‌ند ڕسته مه‌نتیقییه‌ك بکه‌ونه‌وه و وه‌ربگیرێن.

### ٧- خه‌سڵه‌تی تاوتۆلۆجی مه‌نتیق:

له‌سه‌ر زه‌مینه و له پاوانی مه‌نتیقی نوێدا خه‌سڵه‌ته جه‌وهه‌رییه‌کانی ڕسته‌کانی مه‌نتیق به ئاشکرا ناسراو و زانراون. ئه‌مه‌ش چ بۆ تیۆری زانینی ماتماتیك و چ بۆ ڕوونکردنه‌وه‌ی زۆر پرسیاری کێشه له‌سه‌ری فه‌لسه‌فه بایه‌خێکی زۆری هه‌یه.

له یه‌کتری جیاکردنه‌وه‌ی باوی ڕسته بنچینه‌یی و ڕسته دارێژراو و وه‌رگیراوه‌کانی مه‌نتیق کارێکی هه‌ڕه‌مه‌کییه. بۆ ڕسته‌یه‌کی مه‌نتیقی گرنگ نییه له چ ڕسته‌یه‌کی



تره‌وه که‌وتۆته‌وه و وه‌رگیراوه. ڕاستی و بڕکردنی خۆی به فۆرم و ڕوخساره تایبه‌تییه‌که‌ی خۆی ساغ و پشتڕاست ده‌کاته‌وه. ئه‌مه‌ش به‌نموونه‌یه‌کی ساده نیشان ده‌درێت:

به‌پشتیوانی په‌یوه‌سته مه‌نتیقییه‌کان ده‌کرێ له دوو ڕسته (پ. ت) ڕسته‌ی تر دابڕێژرێ. بۆ نموونه: (نا پ)، (پ یاخود ت)، (پ و ت). ڕاستیی ئه‌م ڕسته دارێژراوانه به‌ند نییه به مانای هه‌ردوو ڕسته (پ و ت) به‌ڵکو به‌نده به (به‌های ڕاستییانه‌وه)، واته به‌وه‌وه به‌نده ئایا ئه‌وان له‌خۆیاندا ڕاستن یاخود درۆن. ئێستاکه چوار پۆلی به‌های ڕاستی هه‌ردوو کێشه‌ی (پ و ت)مان هه‌یه: به‌تایبه‌تی:

١- پ ڕاسته و ت ڕاسته: ر ر

٢- ڕاست، درۆ: ر د

٣- درۆ، ڕاست: د ر

٤- درۆ، درۆ: د د.

مانای په‌یوه‌ستییه‌کی مه‌نتیقی به‌وه‌دا دیاریی ده‌کرێ که ئه‌و ڕسته‌یه‌ی به یارمه‌تی ئه‌م په‌یوه‌ستییه‌وه له (پ و ت) دروست ده‌کرێ له چوار جاری شیاوه‌کیدا ڕاست و له‌جاره‌کانی تردا ده‌بێ درۆ بێ. بۆ نموونه: مانای په‌یوه‌ستی «یاخود» به‌وه‌دا دیاری ده‌کرێ (نه‌ك به مانای راده و سنور بۆ دانان) که ڕسته‌ی (پ یاخود ت) له سێ جاری یه‌که‌مدا ڕاسته و له چواره‌مدا ده‌بێ درۆ (هه‌ڵه) بێت. ڕسته دارێژراوه لێکدراوه‌کان ده‌کرێ پتر لێکبدرێن. با سه‌رنجی ئه‌م نموونه‌یه بده‌ین: (نا — ب و نا — ت) یاخود (ب یاخود ت).

ئێستاکه ده‌توانین به‌های ڕاستی له‌چوار جاردا بۆ به‌شه ڕسته‌کان و ئینجا بۆ تێکڕای ڕسته‌که دیاری بکه‌ین. ئیتر له‌مه‌وه ده‌توانین له نموونه‌ی ناوبراودا بگه‌ینه ئه‌نجامێکی سه‌رنجڕاکێشی شایسته‌ی بایه‌خ پێدان که ئه‌مه‌یه: (نا — ب) له جاری سێیه‌م و چواره‌مدا ڕاسته، (نا — ت) له جاری دووه‌م و چواره‌مدا. ئینجا (نا — ب) له‌گه‌ڵ (نا — ت) ته‌نیا له جاری چواره‌مدا ڕاسته[٣]:





| ب - ت | نا - ب | نا - ت | نا - ب و نا - ت | ب یاخود ت | نا - ب لەگەڵ نا- ب یاخود (ب یان ت) |
|---|---|---|---|---|---|
| ١- ر ر | د | د | د | ر | ر |
| ٢- ر د | د | ر | د | ر | ر |
| ٣- د ر | ر | د | د | ر | ر |
| ٤- د د | ر | ر | ر | د | ر |

چونکە (ب یاخود ت) لە سێ جاری یەکەمدا راستە، کەوابوو تەواوی ڕستەکە: (نا - ب و نا - ت) یاخود (ب یان ت) لە هەموو جارەکاندا راستە. ئەم جۆرە فۆرمێلە، کە نە لە مانا و نە لە بەهای ڕاستی ئەو ڕستانەی لێیان پێك هاتووە پشتیان پێ دەبەستێ، سەبارەت بە ڕستە راست یاخود درۆیەکان، بەناچارەکی راستە، پێی دەوترێ تاوتۆلۆجی (واتە بەدەست هێنانی بەدەست هاتوو، یاخود هەمان گوتن- وەرگێڕ).

ڕستەیەکی تاوتۆلۆجی بەهۆ و سایەی فۆرم و روخسارەکەیەوە راستە. دەکرێ نیشان بدرێ چۆن ڕستەکانی مەنتیق و هەموو ڕستەکانی ماتماتیك، بەپێی ئەو بۆچوونەی لێرەدا داکۆکی لێ دەکرێ، چەند تاوتۆلۆجییەکن.

کاتێك ئێمە ڕستەیەکی لێکدراو (یاخود پارچەدار) دەبیستین وەك ئەمە: باران دەبارێ (ئێستا لێرە) یاخود بەفر دەبارێ. بەهۆی ئەم ڕستەیەوە شتێك دەربارەی دەوروبەر دەزانین. چونکە ڕستەکە لەو بابەتەدا باسی دەکات هەندێ شت وەلا دەخات و هەندێك بەکراوەیی دەهێڵێتەوە. لەو نموونەیەدا چوار ڕێتێچون بەدی دەکرێن:

١- باران دەبارێ و بەفر دەبارێ.



٢- باران دەبارێ بەلاّم بەفر نابارێ.

٣- باران نابارێ بەلاّم بەفر دەبارێ.

٤- باران نابارێ و بەفریش نابارێ.

ڕستە ناوبراوەکە رێ تێچوونی چوارەم وەلا دەخات و سێیەکەی تر بەکراوەیی دەهێڵێتەوە. ئەگەر یەکێك تاوتۆلۆجییەکمان پێ بڵێ ئەوا ئەمە هیچ رێ تێچوونێك وەلا ناخات (دوور ناخاتەوە) بەڵکو هەموویان بەکراوەیی دەهێڵێتەوە. بەلاّم ئەم جۆرە ڕستەیە دەربارەی جیهانی دەوروبەر هیچمان پێ ناڵێ، بۆ نموونە: باران دەبارێ (ئێستا لێرە) یاخود باران نابارێ. ڕستە تاوتۆلۆجییەکان بێ ناوەرۆکن، هیچ ناڵێن. ئەمە نابێ ئەوە بگەیەنێ کە ئەم جۆرە بێ بەهان. ئەو تاوتۆلۆجییەی بە نموونە هێنامانەوە ساکار و بێ بەهابوو، بەلاّم هی تر هەن کە خەسڵەتە تاوتۆلۆجییەکەیان دەستبەجێ و لە یەکەم سەرنجداندا نازانرێ.

لەبەرئەوەی ڕستەکانی مەنتیق تاوتۆلۆجی و بێ ناوەرۆکن ناکرێ ئەوەیان لێ بکەوێتەوە، ئایا دەبێ واقیع چۆن بێ یاخود دەبێ چۆن نەبێ. هەموو ئەو میتافیزیکانەی لەسەر بنەڕەتی مەنتیق داڕێژدراون، وەك ئەوەی تاراددەیەکی زۆر لەلایەن هیگڵەوە ڕەنگی ڕێژدراوە و دامەزراوە، کۆششێکە هیچ جۆرە ڕەواییەکی نییە. هەروەها ماتماتیك، وەك لقێکی مەنتیق، تاوتۆلۆجییە. یاخود بە زمانی کانت: ڕستەکانی ماتماتیك شیکارن، ئەمانە ڕستەی لێکدراوی پێشیانە نین. بەم پێیە ڕێبازی پێشیانە بەهێزترین بەڵگەی لەدەست دەرهێنرا. ڕێبازی ئەزموونی، Emprismus واتە ئەو بۆچوونەی دەڵێ: هیچ جۆرە زانینێکی لێکدراوی پێشیانە نییە، لەم جۆرە لێکدانەوەی ماتماتیکدا کێشە و چەڵەمەیەك دەبینێ کە تەنانەت میل نەیتوانیوە بەلایەکیاندا بخات. ئەم کێشە و گرفتە بەوە چارەسەر دەکرێ کە ڕستەکانی ماتماتیك نە ئەزموونین و نە لێکدراوی پێشیانەن بەڵکو شیکارین.





### ٨- زانستی یەکگرتوو:

ئێمە مەنتیقی پیادەکاریی لە مەنتیقی بێ گەرد و کێشە روخسارییەکانی جیادەکەینەوە. مەنتیقی پیادەکاریی: شیکردنەوەی مەنتیقییانەی چەمك و ڕستەکانی لقە جیاوازەکانی زانستەکان. هەر لەم گۆڕەپانەدا مەنتیقی نوێ، ئەگەرچی ئەو بەرهەمانەی تا ئێستا نووسراون بایەخیان بە کێشە روخسارییەکان داوە، سەرکەوتنی دڵخۆشکەری بەدەست هێناوە.

لە ئەنجامی شیکردنەوەی چەمکە زانستییەکانەوە دەرکەوتووە، هەموو چەمکەکان، ئیتر بەپێی دابەشکردنە ئاسایی و ناسراوەکە، ئەمانە سەر بە زانستە سروشتیەکان بن، چەمکی سایکۆلۆجی یان زانستە کۆمەڵایەتیەکان بن بنەڕەتێکی هاوبەش و ناوکۆییان هەیە، دەکرێ بگەڕێنرێنەوە سەر چەندین چەمکی ڕیشەیی کە بە بابەتێکی هاوردە واتە بە ناوەرۆکی راستەوخۆی هەستەکان بەندن. لەپێشدا هەموو چەمکەکانی دەروونی خۆیەکی، واتە ئەوانەی بە رەوشی دەروونیی خۆیەکی زانەرەوە بەندن. بۆ سەر بابەتی هاوردەی راستەوخۆی هەستەوە دەگەڕێنرێنەوە. هەموو چەمکە فیزیکییەکان لەلای خۆیانەوە بۆ سەر چەمکی دەروونی خۆیەکی تایبەتی، دەگەڕێنرێنەوە، چونکە هەموو دیاردەیەکی فیزیکی — سروشتیی لە بنەڕەتدا بەهۆی رێ پێ بردنی هەستەکانەوە ساغ و پشتڕاست دەکرێتەوە. لە چەمك و بیرۆکە فیزیکییەکانەوە چەمکی دەرونی نامۆ (کەسانی تر — وەرگێڕ) دەکەونەوە، ئەوانەی بە دیاردە و قەومانی رەوشی خۆیەکانی ترەوە بەندن. لەکۆتاییدا چەمکەکانی زانستییە کۆمەڵایەتیەکان سەر ئەو جۆرە چەمکانەی ناوبران دەگەڕێنەوە. بەم جۆرە سەجەرەی (درەخت)ی چەمکەکان دەکەوێتەوە (سیستەمی دانان) تیایدا هەر چەمکێکی زانستی دەبێ بەپێ ئەو داڕشتن و وەرگرتنەی کە لە چەمکی ترەوە و لەدواییدا لە ناوەرۆکی هاوردەی هەستەکانەوە، جێگای خۆی بدۆزێتەوە و بۆی دیاری بکرێت، سەرەڕای ئەمانە تیۆری دانان روونی دەکاتەوە، بەهەمان رێگا و شێواز هەموو ڕستەیەکی زانست دەکرێ وەربگێڕدرێتە سەر ڕستەیەکی ناوەرۆکی هاوردەی هەستەکان واتە (پۆزیتیڤیستی پەیڕەوەکی).



خاڵێکی دووەم، هەر هەمان شت، هەموو چەمکە سەرتاپاگیرەکانی سیستەمی دانان بە چەمکەکانی فیزیك وەك چەمکی بنەڕەتی پشت دەبەستن واتە: ئەو چەمکانەی بە دیاردەی شوێن و کاتەوە بەندن. چەمکەکانی سایکۆلۆجی و زانستە کۆمەڵایەتیەکانیش دەچنەوە سەر ئەم چەمکانەی باسکران، ئەمەش بەپێی بنەڕەتی رێبازی رەفتارەکی (مەتریالیزمی پەیڕەوەکی).

ئێمە لێرەدا باسی پۆزیتیڤیزمی پەیڕەوەکی و مەتریالیزمی پەیڕەوەکی دەکەین، چونکە بابەتەکە لەخۆیدا تەنیا پەیڕەوی داڕشتن و وەرگرتن و لێوە دەرهێنانی چەمکەکانە. لێرەدا تێزە میتافیزیکی — پۆزیتیڤیستییەکە دەربارەی واقعیەتی بابەتی هاوردەی هەست و تێزەی میتافیزیکی — مەتریالیستی لەبارەی ریالیستی بابەتە فیزیکییانەوە وەلانراون و دوور لە باسەکە دەمێننەوە. لەمەدا ئەوە دەکەوێتەوە کە هەردوو سیستەمی دانانی پۆزیتیڤیستی و مەتریالیستی ناکۆك بەیەکتریی نین. هەردووکیان دروستن و ڕەوان و ناکرێ دەستبەردارییان بن. سیستەمە پۆزیتیڤیستەکە بەرامبەر بە بۆچوونی تیۆری زانینە چونکە راستیی زانین بەوەدا راست و پشت ئەستور دەکاتەوە کە دەیگێڕێتەوە بۆ سەر بابەتی هاوردەی هەستەکان. سیستەمی مەتریالیستی وەك بۆچوونی زانستی واقیعی وایە لەوەدا هەموو چەمکەکان دەگەڕێنرێنەوە بۆ سەر چەمکی فیزیکی، بۆ سەر تاکە بنچینەیەك کە قانون سالاریی دەردەخات و زانینی نێو خۆیەکی دەستەبەر دەبێ.

بەم جۆرە شیکردنەوەی مەنتیقی بە یارمەتی ئامرازەکانی مەنتیقی نوێ بەرەو زانستی یەکگرتوو دەمان بات. چەندین زانستی جیای پەیڕەو لەبنچینەدا جیاواز یاخود چەندین سەرچاوە جیای زانین نییە بەڵکو تەنیا یەك زانست هەیە، هەموو زانینێك لەنێو ئەودا جێگای خۆی هەیە تەنانەت وەك چەند زانینێکی لەبنچینەدا شێواز وەك یەك. ئەو جیاوازییە رواڵەتی و رووکەشییەی بەرچاو دەکەوێ لەوەوە کەوتۆتەوە کە بۆ دەربڕینی مرۆڤ چەندین لقە زمانی جیاواز بەکاردێنێ.





## ٩- پووچەڵكردنەوەی میتافیزیك:

لە خەسڵەتی تاوتۆلۆجی مەنتیقەوە تاوتۆلۆجییەتی ئەنجامگیریی کەوتۆتەوە: ئەنجام هەمیشە ئەوە دەڵێ کە لەسەرەتاکاندا هاتووە بەلاّم بە شێوە و روخسار و فۆرمە زمانێکی تر. هیچ جارێك ناکرێ لە فاکتێك، راستیی قەوماو و رووداوێك، یەکێکی تر بکەوێتەوە. (بەپێی بۆچوونی باو و ئاسایی ئەمە لە ئەنجامگیریی ئیندەکتیڤیدا دەکەوێتەوە. بەلاّم شیکردنەوەی مەنتیقی ئەگاتە جۆرێکی تری لێکدانەوە، لێرەدا ناکرێ باسی بکەین). لەمەوە ناشیاوەکی هەموو ئەو جۆرە میتافیزیکە کە دەیەوێ بەهۆی ئەزموونەوە بوونی بابەتێك ساغ و سوور بکاتەوە کە ترانسندنتال و لەودیو ئەزموونەوەیە و بەهیچ جۆرە ئەزموونێك دەرکی پێ نابردرێ دەکەوێتەوە. بۆ نموونە بوونی «شت لە خۆیدا» لەپشت بابەتەکانی ئەزموون (شارەزاییەوە — خبرە). بوونی «بێ مەرج» و «رەها» لە پشت پابەندی مەرج، «جەوهەر» و «مانای» دیاردە و رووداو لەپشت و لەودیو و رووداو و دیاردەکان خۆیانەوە. ئەنجامگیریی ورد و پتەو هیچ کاتێك نابێتە مایەی هەنگاونان لە شارەزاییەوە (ئەزمونەوە) بەرەو ترانسندنتال. ئەنجامگیریی میتافیزیك چەندین کەموکوڕیی و کەلەبەری تێدایە بۆیە وا دەزانرێ گوایە جۆرە ترانسندنتالیەکی لێ کەوتۆتەوە. چەندین چەمك بەکاردەهێنرێن کە نە بنچینەیەکی ناوەرۆکی هاوردەی هەست و نە بنەمایەکی فیزیکیان هەیە. ئەمانە زڕە چەمکن بۆیە لەلایەن تیۆری زانین و لە بۆچوونی زانستییەوە لە ناوەرۆکدا رەت دەکرێنەوە. ئەمانە چەند وشەیەکی پووچن و ئەگەرچی کەلەپوری کۆن و داب و دەستور رێزیان لێ دەنێن و پەیوەندییان بەهەست و نەستەوە هەیە و ختوکەی هەست دەدەن.

بەهۆی پەیڕەوە ورد و راستەکەی مەنتیق دەکرێ زانست لەبنەڕەتدا مشتومالّ بکرێت. پێویستە هەر ڕستەیەکی زانست لەکاتی شیکردنەوەی مەنتیقیدا وەك ڕاست و دروست خۆی ساغ و پشتڕاست بکاتەوە. لێرەدا دەکرێ دەربکەوێ ئایا ئەم رستانە هەمانگۆیین (تاوتۆلۆجین) یاخود ناکۆکن (ناکردنی هەمانگۆی) ئەوسا ئەم رستانە سەر بە بابەتی



مەنتیق و بیرکاری دەبن. یاخود ڕستەکە ناوەرۆکێکی بەپێز و پڕ مانای هەیە، واتە نە تاوتۆلۆجییە و نە ناکۆکییە، کەوابوو ڕستەیەکی ئەزموونەکییە. ئەم جۆرە ڕستەیە دەکرێ بگەڕێنرێتەوە سەر ناوەرۆکی هاوردەی هەست و ئەوکاتە لەبنچینەدا ساغ دەبێتەوە کە ڕاستە یان هەڵە و درۆیە. ئەم جۆرە ڕستانە (ئەوانە راست یاخود درۆن) ڕستەی زانستە ریالیستیەکانن (ئەزموونییەکان). ئەوی راست بێ پرسیارێك نییە کە بریتی بێ لە تیۆری یاخود بریتی بێ لە سیستەمێکی ڕستەی تایبەتی شان بەشان هی زانست. فەلسەفەکردن لەمە بەولاوەتر نییە:

چەمك و بیرۆکە و ڕستەکانی زانست بەهۆی شیکردنەوەی مەنتیقی روون بکرێتەوە و لێك بدرێنەوە. ئامرازی ئەم کارە مەنتیقی نوێیە.

## پەراوێز

١- مەبەست لە گۆڤاری «زانین»ی ئەڵمانیی Erkenntnis کە ئەم باسەی تیادا بلاّوکراوەتەوە. بڕوانە:

Carnap, Rudolf, Die alte und die neue Logik. In: Erkenntnis. Bd. I. S. 12-26. Leipzig. 1930-1931.

٢- وشەی بار لێرەدا لە جیاتی وشەی ئەڵمانی «Prädikat» بەکارهاتووە کە بەرامبەر بە وشەی (مەحمولی — مەنتیق و خەبەر و موسنەدی رێزمان)) لە عەرەبیدا بەکارهاتووە.

٣- لەم خشتەیەدا، پیتی (ر) لە جیاتی راست و پیتی (د) لە جیاتی درۆ یاخود هەڵە، بەکار هاتوون. وەرگێڕ.





## سەرچاوەکانی تێکستی هەڵبژاردە


- سەرچاوەی سەرەکیی مەنتیقی سیمبۆلی:

- A. N. Whitehead and B. Russell, Principia Mathematica. University Press, Cambridge. 3. Bde. 1910-1913. 2. Auflage. 1925-1927.

- وەك سەرەتا:

- D. Hilbert und W. Ackermann,. Grundzüge der theoretischen Logik. Springer. Berlin 1928.
- R. Carnap., Abrib der Logistik. Wien 1929.

- پەرەسەندنی مێژوویی بابەتەکە:

- C. I. Lewis., Survery of Symbolic Logic. Uni. Of Cal. Press, Berkeley 1918.
- A. Fraenkel., Einleitung in die Mengenlehre. Berlin (1910). 3. Auflage 1928.

- گرینگترینی بەرهەمە کۆنەکان:

- G. Frege., Begriffsschrift. Nebert Halle 1879.
- Die Grundlagen der Arithmetik. Breslau 1884.
- Grundgesetze der Arithemtik. 2 Bd. Jena 1893-1903.
- G. Peano., Notations de Logique mathematique. Bocca. Torino 1894.
- Formulaire de mathematiques. Bocca, Torino (1895) 1908.
- E. Schröder., Vorlesungen über die Algebra der Logik. 3Bde. Teubner, Leipzig, 1890-1905.

- بایەخ و سوودی مەنتیقی پەیوەندییەکان بۆ فەلسەفە:





- B. Russell, unser Wissen vonder Aussenwelt. Leipzig 1926.

- ناکۆکییەکانی مەنتیق: هەردوو کتێبی لەسەرەوە ناوهێنراو:

- Principia Mathematica. Fraenkel: Mengenlehre.

- دارِشتنی ماتماتیك:

- B. Russell., Einführung in die mathematische Philosophie. Munchen 1923.
- H. Behmann., Mathematik und Logik. Leipzig 1927.
- R. Carnap., Die Mathematik als Zweig der Logik. In: Blätter für deutsche Philosophie. 4. 1930

- خەسڵەتی تاوتۆلۆجی مەنتیق:

- L. Wittgenstein., Tractatus Logico – Philosophicus.

- شیکردنەوەی چەمکەکان:

- R. Carnap., Der Logische Aufbau der Welt. Berlin 1928.

- پووچەڵ کردنەوەی میتافیزیك:

M. Schlick., Erleben, Erkennen, Metaphysik. In: Kantstudien 31-1926.
- R. Carnap., Scheinprobleme in der Philosophie 1928.






## سەرچاوەکانی کتێب


- Aristoteles, Metaphysik. Berlin 1990.
- Born, Max., Über den Sinn der physikalischen Theorien. in: Naturwissenschaften. 17. Jg. Berlin 1924.
- Boltzmann, L., Populäre Schriften. 3. Auflage Leipzig 1978.
- Buzello, H., Kritische Untersuchung von Machs Erkenntnis theorie. Neuedruck Würzburg 1970.
- Carnap, Rudolf., Scheinprobleme in der Philosophie. 1960.
- Die Physikalische Sprache als Universalsprache der Wissenschatt. In: Erkenntnis. Bd. 2. Leipzig 1932.
- Logische Syntax der Sprache. Wien 1934.
- Der Logische Aufbau der Welt, Hamburg 1974.
- Die alte und die neue Logik. In: Erkenntnis. Bd. I. Leipzig 1930-1931.
- Von der Erkenntnistheorie Zur Wissenschaftslogik. In: Actualites Scientifiques…. Actes du Congers interna… du Philosophie Paris 1931. Bd. I.
- Mein Weg in die Philosophie. Reclam 1993.
- Der Raum. Berlin. 1932.
- Überwindung der Metaphysik durch die Logische Analyse der Sprache. In: Erkenntnis. Bd. 2. Leipzig 1932.
- Cassirer, Ernst., Die Philosophie der Aufklärung Tübingen 1973.
- Copleston, Fredrick., Ahistory of Philosophy. Vol. 5. Part. II. NewYork 1959.
- Einstein, Albert., Geometrie und Erfahruny. In: Sitzung sberichte der Preussichem Akademie der Wissenschaft. Akademie Verlag Berlin. DDR. 1978.
- Ferrari, M., Über die Ursprung des Logischen Empirismus… In: E. Rudolf (Hrsg): Von der Philosophie zur Wissenschaft. Meiner 1977.





- Hahn, Hans., Die Bedeutung der Wissenschaftlichen Weltaulfassung…. In: Erkenntnis. Bd. I. Leipzig 1930-1931.
- Heisenberg, Werner., über den anschaulichen Inhalt der quanten theoretischen kinematik und Mechanik. In: Zeitschrift Physik. Bd. 43 Berlin 1927.
- Der Teil und das Ganze. München 1969.
- Horstmann, Hubert, Der Physikalismus als Modelfall Positivistischer Denkweise. Berlin (ost) 1973.
- Hume, David, Ein Traktat über die menschlichen Natur. Hamburg 1973.
- Kant, I., Grund Legung zur Metaphysik der Sitten. In: Werke in sechs Bänder Bd. 3. koenemann 1995.
- Prolegomena. Bd. 3.
- Kritik der reinen Vernunft. Bd. I.
- Kraft, V., Der Wiener Kreis. Wien 1968.
- Lucka, Emil., Das Erkenntnis Problem… In: Kantstudien. Jg. 8. 1903.
- Mach, Ernst., Die Analyse der Empfindungen. Darmstadt 1982.
- Neurath, otto, Protokoll Satze. In: Erkenntnis Bd. 2. Leipzig 1932.
- Planck, Max., Vorträge und Erinnerungen. Darmstadt 1970.
- Popper, Karl., Logik der Forschung. Tübingen 1976.
- Russell, B., Einfuhrung in die mathematische Philosophie. Darmstadt….
- Schlick, Moritz., Die Wende der Philosophie. In: Erkenntnis. Bd. I. Leipzig 1930-1931.
- Erlebem, Erkennen, Metaphysik. In Kantstudien. Bd. 31. 1926.
- Steg müller, W., Hauptströmungen der Gegenwarts Philosophie Bd. I. Stuttgart 1978.
- Wiener Kreis, Wissenschaftliche Weltautfassung. Wien 1929.
- Waismann, F., Wittgenstein und die Wiener Kreis. Stw 503.
- Wittgenstein, Ludwig., Tractatus Logico – Philosophikus. Frankfurt a/M 1960.